# جوانكاریی
# شیعری نەتی كوردی

د. ئیدریس عەبدوڵڵا

# جوانکاریی
# شیعری نوێی کوردی

**د. ئیدریس عەبدوڵڵا**

**مامۆستای ماددەکانی (شێوازی ئەدەبی) و (گفتوگۆی زانستی)**

**لە بەشی کوردی کۆلێژی زمانی زانکۆی سەلاحەدین**

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **جوانکاریی شیعری نوێی کوردی**
- **نووسەر: د.** ئیدریس عەبدوڵڵا
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جمال رواندزی
- **بەرگ: هێمن**
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دیناری
- **چاپی یەکەم :** ٢٠١٢
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی هێڤی (هەولێر)
- لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٠٠٦) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە

**زنجیرەی کتێب (٦٤٧)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێڕست

## پێشکەشە بە:

**١ـ رۆحی دایکم..**

ئەو ژنە بەڕێزەی گەورەی کردم و شتی زۆر گرنگی فێرکردم

**٢ـ رۆحی باوکم..**

ئەو پیاوە بەڕێزەی بە بیر و ماندووبوونی خۆی پێیگەیاندم

هەمیشە دەڵێم خودا ئێوەی پێم نەبەخشیبووایە، من قەت نەدەبوومە ئەو پیاوەی ئەمڕۆ، بۆیە سوپاسی خودای میهرەبانم دەکەم.. ئینجا سوپاسی ئێوەی ئازیزیشم دەکەم و هەمیشە لە دەفتەری بیرەوەرییەکانم وەکو دوو فریشتەی خێر و جوانی دەمێننەوە

بچوکتان ئیدریس

شەوی جەژنی قوربانی ١٤٣١ی هیجری

١٧/١٦ی تشرینی دووەمی ٢٠١٠ی زایینی

## دەروازە:

لە وەتەی ئادەمیزاد هەیە، هەموو بیست و چوار کاتژمێرێك ڕۆژێکی نـوێی لـێ هەڵـدێ، ڕۆژێك بە ساردی و گەرمی، باران و بەفر و تەزرە، تـۆز و خـۆڵ، شـنە و ڕەشـەبا، کـورتی و درێژی، ژیان و مردنی زەوی، بە کورتی بە هەموو ئەو شتانەی لە خۆی دەگرێت، بە تەواوی لە ڕۆژەکەی پێش، یان پاشە خۆی جیایە، ئەمە بۆ ئەوەیە هەموو ڕۆژێك پەیامی نوێبوونەوە بـە گوێی ئادەمیزاد بدات و تێی بگەیەنێت، کە ژیـان واتـە بەرەوپێشچـوون و نوێبوونـەوە، بۆیـە ئادەمیزادیش درێغی نەکردووەو هەمیشە نوێبووەتـەوە، لێرەوەیـە نوێبوونـەوە لـە ئـەدەبیش بۆوەتـە پرۆسـەیەکی هەمیشـەیی و بـە بـەردەوامی لەگـەڵ بەرەوپێشچـوونی ئـادەمیزاد، ئەدەبەکەشی بەرەوپێشچووەو نوێبووەتەوە.

ئەدەبی نوێی کوردی ئەدەبی سەدەیەکی دیکەیە، سەدەیەك لە بیر و ڕۆشنبیری و سیاسەت و باری خوێندەواری و زەوق و پێویسـتییەکانی تـاك و بیناسـازی و ململانێـی زەبەلاحـەکانی نێودەوڵەتی لەسەر بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی کۆمپانیا تایبەتییەکانیان و شەڕە جیهانییەکان و ستەمە نێوخۆییەکان و خەنی کردنی هەندێ نەتەوەو دابەشکردنی هەندێ نەتەوەی دیکە، لە هەموو ئەوانە و گەلێکی دیکەش لە سەدەکانی پێشووی جیابوو، بۆیە ئەدەبیش بووە زمانحاڵی ئەم سەدەیە نوێیەو بە جیا لە سەدەکانی پێشوو بەرهەمەکانی خستە بەردەسـتی خوێنـەرانی. ئەوەش بۆوە هۆی ئەوەی شێواز و دەربڕین و تێڕوانینی جوانیناسـانەی شـاعیر و ئەدیبـەکانی سەدەی نوێ، جیابێ لە جیهانبینی و دیدی جوانیناسانە و شێواز و دەربڕین و بیری ئـەدەبیاتی پێشوو، بەڵام بێگومان بەسوود وەرگرتن لە کۆنەکە ئەدەبە نوێیەکـە بەرەوپێشچـوو، ئەمـەش وایکرد، شیعری نوێ شتێك لـە کۆنەکـەی تیـا بمێنـێ و شـتانێکیش لـە بیرەخـۆی بباتـەوە، شتانێکی تازەش بێنێ و بۆشایی کۆنە فەرامۆشکراوەکانی پێ پـڕ بکاتـەوە، لێرەوەیـە وەکـو دیاردە شیعری نوێش شایانی گرنگیپێدان بوو، بۆیـە ئـەم لێکۆڵینەوەیـەش لـە ڕووی شـێوازە جوانکارییەکان لە بەرهەمی شاعیرانی نوێ دەکۆڵێتـەوە، هاوکـاتیش کتێبێکـی دیکـەی بـە

هەمان مەبەست بۆ شیعری کلاسیك لەگەڵ ئەمە دەردەچێت، بە هەردووکیان دیدی جوانی لای هەردوو کۆمەڵە شاعیرانی کۆن و نویێ بەرجەستە دەکەن، لێیانەوە بە دیار دەکەوێت، کۆن بە چی و نوێ بە چی لە یەکتری جیاوازن.

ئەو کارەش بە لای خۆمەوە زۆر گرنگە، چونکە زۆر کەس وا بیردەکاتەوە، کە نوێ بە بێ هونەر و بێ رەوانبێژییەو گرنگی بەم مەسەلانە نادات، بەڵام وەکو لێرە دەردەکەوێ، بە پێچەوانەوە راستە، شیعری نوێش خۆی بە شێواز و هونەرە رەوانبێژییەکان جوان و رازاوە، دڵگیر و رەوان دەکات، بەڵام جیاوازی لەگەڵ کۆنەکە ئەوەیە، لێرەدا شاعیر گرنگی بە هەندێ هونەری دیکە دەدات و لە کۆنەکەش هەندێك وەردەگرێت و هەندێك فەرامۆش دەکات، واتە لە کۆنەکە بە شێوەیەکی رێژەیی جیایەو سەدا سەد فۆتۆی ئەو نییە.

## له بارەی ئەم کتێبەوە:

لێکۆڵینەوە لە بواری ڕەوانبێژیدا هێشتا لای کورد وەکو پێویست نەچۆتە پێش، هێشتا کارێکی تەواو و پوخت نییە، کتێبخانەی کوردی شانازی پێوە بکات و خوێنەری کورد تامەزرۆی پێوە بشکێت، ڕاستە هەوڵی باش لە بوارەکە دراوەو کاری باش لە لایەن هەندێ بەڕێز لەو بوارەدا پێشکەشکراون، بەڵام دیسانەوەش دەرگا بۆ گەلێ لێکۆڵینەوەی دیکە لە تەواوی هونەرەکانی هەر سێ زانستی ڕەوانبێژی والایە. ئەم هۆیە وای کردووە وەکو لێکۆڵەرێك، کە مەبەستم بێت خزمەتێك بە ئەدەبی نەتەوەیی بکەم، لەو لایەنەوە لێکۆڵینەوەی بابەتی و ڕەخنەییانە لە هونەرە ڕەوانبێژییەکانی نێو ئەدەبیاتی کوردی و بە تایبەتی شیعری نوێی کوردی ئەنجام بدەم، بۆیە ئەو کارەی ئێرەشم یەکێکی دیکەی ئەو هەوڵانەمە، کە پێشتریش لەو بوارەدا داومن.

بەشی یەکەمی ئەم کتێبەم تایبەتە بە شێوازەکانی جوانکاری وشەیی: (١٣) هونەری بە چەندین شێواز و جۆری لە یەکجیا باسکردووە، بریتینە لە: ڕەگەزدۆزی .. لێرەدا تیشك خراوەتە سەر هەردوو جۆری (ڕەگەزدۆزی تەواو و ڕەگەزدۆزی ناتەواو)، لە (ڕەگەزدۆزییە ناتەواو)ەکەشدا باس لە (٦) جۆری وەکو: جودا، ڕەها، زیاد، هاوکێشی، پێچەوانەیی، کەرتی کراوە.. هێنانەوە، گێڕانەوە، گەڕانەوە، پاتکردنەوە، لەمەدا (٤) جۆری: ئاسایی، جەختێنراو، یەکسەری، بەدواییەك داهێنراو کراوە.. بوونی پێویستە، لێیەوەرگرتن، تێکهەڵکێش، لە هەریەکەیان باس لە زیاتر لە شەش حەوت شێوەیان کراوە.. دوو سەروا، دواخستن، سەرواداری موتڕیف، سەرواداری متەوازن، سەرواداری متەوازی.

هەرچی بەشی دووەمیشە تایبەتە بە جوانکاری واتایی، لەم بەشەشدا تیشك خراوەتە سەر (٢٩) هونەر، بە چەندین شێوەو جۆری لە یەکجیایان، بریتینە لە: دژیەك بە هەردوو جۆری فەرهەنگی و نافەرهەنگی.. جگە لەمانە (٤) جۆری وەکو: دژیەکی تاك حاڵەت و فرە حاڵەت و تێکەڵ باسیان لێوەکراوە.. بەرابەری لەمەش سێ جۆری (بەرامبەری ڕێك) و (بەرامبەری ناڕێك) و (بەرامبەری فرە حاڵەت) تیشکیان خراوەتە سەر.. چاولەیەك.. پێچە و پەخشە لەمەشدا (٣) جۆری (پێچە و پەخشەی ڕێك) و (پێچە و پەخشەی ناڕێك) و (پێچە و پەخشەی

تێکەڵ ـ نادیار ـ) باسکراون.. جوانی بایس.. کۆکردنەوە.. کۆکردنەوە لەگەڵ روونکردنــەوە.. لێککردنەوە.. دابەشکردن.. لێککردنەوە لەگەڵ دابەشکردن.. کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن .. دابەشکردن و کۆکردنەوە .. وەصفی لە بــەرگی لۆمــە.. لۆمــە لــە بــەرگی وەصــف.. پۆشــین لەمەشدا دوو جۆری (پۆشینی رووت) و (پۆشینی پالاو) تیشــکیان خراوەتــە ســەر.. رێبــازی گوتەیی.. جێگۆڕین.. ئــەو گاڵتەیــەی مەبەســت لێــی راســتییە.. تێلنیشــان.. فرەواتــایی.. بەهەڵەبردن.. فێلکردن.. خۆهەڵەکردن.. گردکردنــەوە.. روونکردنــەوە لەمەشــدا ســێ جــۆری (روونکردنــەوەی ئاســایی) و (روونکردنــەوەی بەدواییەکــداهاتوو) و (روونکردنــەوەی درێــژە) تیشکیان خراوەتە سەر.. وەرچەرخان.. دەرهێنان.. هێماکەر.. هاوســەنگیکردن.. گێڕانــەوەی گفتوگۆ.

هەرچی بەشی سێیەمیشە تایبەتکراوە بە (جوانکاری تێکەڵ) و تێیدا تیشك خراوەتە سەر دوو هونەری ئیقتیداو داهێنان.

بەم شێوەیە ئەم لێکۆڵینەوەیە (٤٢) شێوازی هونەری جوانکاری باســی لــێ کــردووە، بــە هەموو ئەوەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەردەکەوێت، کە شیعری نوێی کوردیش گــەلێ دەربڕینــی هونەری جوانی تێدا هاتووەو بە هۆیانەوە شیعرەکان جوان و رەوان و کاریگەر بوونە.

# بەشی یەکەم

# شێوازەکانی جوانکاری وشەیی

## رەگەزدۆزی:

رەگەزدۆزی (الجناس).. بریتییە لە بوونی دوو وشە لە دەربڕیندا لێکچووبن و لە واتادا جیاوازبن.. یان بە واتایەکی تر: هەقیقەتی رەگەزدۆزی ئەوەیە، وشە دەربڕاوەکان یەکبن، یان هاوشێوەو یەکچووبن، واتاشیان جیاوازبێت.. ئەمەش دوو جۆری هەیە، بریتینە لە: رەگەزدۆزی تەواو و رەگەزدۆزی ناتەواو.

## جۆرەکانی رەگەزدۆزی:

ئەگەرچی رەوانبێژان و زانایانی (جوانکاری)، بە تایبەت لە عەرەبیداو هەروەها لە کوردیش دابەشین و بەدواداچوونی زۆریان کرد بێ و تا رادەیەك بابەتەکەیان فراوانکردبێ، بەڵام نزیکترین دابەشین لە راستییەتی بابەتەکە ئەوەیە، کە: رەگەزدۆزی دوو جۆری سەرەکی هەیە:

١ـ رەگەزدۆزی تەواو: بریتییە لەوەی دوو وشەکان، لە چوارشتدا یەکبن، ئەوانیش: جۆری پیتەکان، ژمارەیان، شێوەیان، ریزبوونیان.

٢ـ رەگەزدۆزی ناتەواو: ئەمەش ئەوەیە، کە دوو وشەکان لە یەکێ لەو چوار مەرجانەی رەگەزدۆزی تەواوی لەسەر دادەمەزرێ جیاوازبن، با ئیتر لە سێ یان دوو شتی دیکەشیان لێکچووبن.

## یەکەم: رەگەزدۆزی تەواو

ئەمە وەکو گوتمان، بریتییە: لە بوونی دوو وشە، لە شێوەدا وەك یەك و لە واتادا جیاوازبن.. ئەمەش جوانییەکی گەورە و چێژێکی خۆش بە خوێنەر و پێش ئەو بە شاعیریش دەبەخشێت، چونکە هەستی کردووە فەرهەنگی وشەکانی دەوڵەمەندەو بێ تەئەموول وەکو (نالی) دەڵێت: لە مەیدانی فەصاحەتدا زوبانی رادەکا.. بۆیە شاعیر نییە بایەخی پێنەدابێت و

ئەوەندەی بۆی کرابێت، سوودی لەو هونەرە وەرنەگرتبێت بۆ جوانکردن و بەهێزکردنی شیعرەکانی.. بۆ نموونە:

**ـ کاوە کە هەڵێکرد ئاڵا**

**گەل لە قەڵای زۆردار ئاڵا... کامەران موکری**

لەم دێڕە هۆنراوەیەدا، دوو وشەکانی (ئاڵا) لە هەر دوو نیوە دێڕدا (رەگەزدۆزی تەواو) دروست دەکەن، چونکە دەبینین هەردوو وشەکان جۆری پیتەکانیان یەکە، پێکهاتوونە لە (ئـ ـ ا ـ ڵ ـ ا).. ژمارەی پیتەکانیان بە هێندەی یەکە، هەردووکیان لە (چوارپیت) پێکهاتوون.. شێوەی پیتەکان لە هەردوو وشەدا وەك یەکە، بە یەك شێوەش بەدوای یەکتردا ریز بوونە.. ئینجا گەر لە رووی واتاشەوە سەرنجیان بدەین، دەبینین: لە نیوە دێڕی یەکەمدا (ئاڵا) بە واتای بەیداخ و پەرچەمی خەبات و شۆڕش.. لە نیوە دێڕی دووەمیشدا (ئاڵا) فرمانێکەو بە واتای کۆبوونەوەی خەڵکی دێت بە دوای (ئاڵا)کەی شۆڕشی (کاوە)و راپەڕین و پەلاماردانی ئەو خەڵکە لە دژی قەڵای زۆردار، بەوەش رەگەزدۆزی تەواو دروستبووە.

**ـ دوارۆژی رەش بەدی دەکەن**

**کەچی هێشتا بەدی دەکەن...دڵزار**

(بەدی) لە نیوە دێڕی یەکەمدا تەواوکەری چاوگی سادەی (کردن)ەو چاوگی لێکدراوی (بەدی کردن) بە واتای (دەبینن) هاتووە، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم، بە تەنیا و بە واتای (خراپەکردن) هاتووە، واتە: خراپە دەکەن، ئەمەش (رەگەزدۆزی تەواو)ی دروست کردووە.

**جۆرەکانی رەگەزدۆزی تەواو**

بە گوێرەی بوونی رێزمانی ئەو وشانەی رەگەزدۆزییە تەواوەکە دروست دەکەن، ئەم جۆرانەی رەگەزدۆزی تەواو بەدی دەکەین:

١ـ رەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو وشە، هەردووکیان (ناو)بن، بۆ نموونە:

**ـ خاترم چەند رۆژ خەستەی خەمان بوو.**

**چاوانی سەرم وەك چاوان وابوو... پیرەمێرد.**

(چاوان)ی یەکەم: ناوێکی کۆیە، بریتییە: لە دوو چاوەکانی سەری ئادەمیزاد.

(چاوان)ی دووەم: ناوێکی تری کۆیە، بە واتای سەرچاوەی ئاو و کانییاوەکان هاتووە.

هەردووکیان: ژمارە و جۆر و شێوە و ریزبوونی پیتەکانیان وەك یەکە، بەڵام وەك دەبینین بە دوو واتای جیاواز دێن.

٢ـ رەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو وشە، یەکەمیان (ناو) و دووەمیان (چاوگ) بێت، بۆ نموونە:

**ـ بۆ ژیر و خاوەن دیدە**

**بوون بۆ بوونی شاهیدە... جەمال بێدار**

(بوون)ی یەکەم بە واتای (بوونەوەر بە گیاندار و بێگیانانی) (ناو)ە، (بوون)ی دووەم بە مانای (هەبوون ـ وجود) دێت، (چاوگ)ەو وەکو ناو بەکارهاتووە، بەمەش رەگەزدۆزی تەواو دروست بووە.

٣ـ رەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو وشە، یەکەمیان (راناوی سەربەخۆ) و دووەمیان (ناو) بێت، بۆ نموونە:

ـ تۆ بووی کە خوات پێمان ناساند

تۆ تۆوی باوەڕت وەشاند... جەمال بێدار

(تۆ)ی نیوە دێڕی یەکەم و سەرەتای نیوە دێڕی دووەم: راناوی سەربەخۆی کەسی دووەمی تاکە.. بەڵام (تۆ) لە وشەی (تۆوی)دا، واتە (حەب)، (تۆوی رووەك و دار و درەختە)، کە لێرە بە خوازە بۆ (باوەڕ) بەکارهێنراوە، بەوەش رەگەزدۆزی تەواو دروستبووە.

٤ـ رەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو وشە، یەکیان (ناو) و ئەوی تر (ئاوەڵناو) بن، بۆ نموونە:

ـ جوان گوڵە جوانەکەی دایە

خێراکە، راکە، سەرمایە... باوکی ئازیز

لە نیوە دێڕی یەکەمدا دووجار وشەی (جوان) هاتووە.. یەکەمیان (ناو)ە، دووەمیشیان کە بەدوای وشەی (گوڵ) دا هاتووە، (ئاوەڵناو)ەو پەسنی ناوی (گوڵ)ی داوە، هەردووکیان جۆر و ژمارە و شێوە و ریزبوونی پیتەکانیان وەك یەکە، بەڵام لە واتادا وەك دەبینین یەکەمیان لە بری ناوی منداڵێك هاتووە، دووەمیشیان وەك (ئاوەڵناو)و، پەسندەری ناوی (گوڵ)ەکە هاتووە.

٥ـ رەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو وشە کە هەردووکیان (فرمان)ن، بۆ نموونە:

ـ قورینگ چلەی زستان دەبڕن

چاویان لە کوردستان دەبڕن... سوارەی ئیلخانی زادە

(دەبڕن)ی نیوە دێڕی یەکەم بە واتای تێدەپەڕینن، بەسەردەبەن، (دەبڕن)ی نیوە دێڕی دووەمیش بە واتا: دەکەن و کە دەستە سەرچاوەکە، یانی چاو لە کوردستان دەکەن، ڕوودەدەنە کوردستان و بۆ ئێرە دێن.

ـ کاتێ شاعیر گڕ دەگرێ

پێنووسەکەی لە باوەشی پەنجەکانی

بە توند دەگرێ... جەمال گردەسۆری

(دەگرێ)ی یەکەم (فرمان)ە، واتە: تێبەربوون.. (دەگرێ)ی دووەم (فرمان)ە، واتە: لە دەست گرتن، بەمەش (رەگەزدۆزی تەواو) دروستبووە.

٦ـ رەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو وشە یەکیان (ناو) و ئەوی دیکەیان (فرمان).. بۆ نموونە:

ـ بێ رووبەستێ

هەی دێ هەی دێ

دێ بە دێ دێ... خدر کۆساری

(دێ)ی یەکەم و دووەم لە ریزی سێیەمدا (ناو)ە واتە (گوند)... (دێ)ی سێیەمیش لە هەمان رستەدا: واتە: دەهێت، (فرمان)ە، بەوەش (رەگەزدۆزی تەواو) دروست بووە.

**دووەم: رەگەزدۆزی ناتەواو:**

بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە یەك، یان زیاتر لە مەرجێکی (رەگەزدۆزی تەواو) لە دەست دەدات، واتە: بەشێکی گرنگی (رەگەزدۆزی)یە، لە دوو وشە پێکدێت، کە تا رادەیەك لێکچوون لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام لێکچوونەکە تەواو نییە، لە واتاشدا هەردوو وشەکان لە یەکتری جیاوازن و هەریەکەو واتای سەربەخۆی خۆی هەیە، ئەوەش زیاتر لە جۆرێکی هەیە، وەکو (جودا و کەرتی و زیاد و پێچەوانەیی و هاوکێشی و...هیدیکە).

**١ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی جودا:**

بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە ژمارەو شێوەی ریزبوونی پیتەکانیان وەك یەك بێ، بەڵام لە یەکێ لە پیتەکانیان لە یەکتری جیاواز بن.. بۆ نموونە:

ـ وانەی شەهیدیت ئەوەندە بەرزە

کۆشکی دوژمنی پێهاتە لەرزە... ڕەنجدەر ... پاوە

وشەکانی (بەرزە) و (لەرزە) ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری جودا دروست دەکەن، چونکە لە یەك پیتیان لە یەك جیان.

ـ هەر لە یادمە دەنگی مەشکەی پڕ

ئاگری تەپاڵە تەپەی نان و گڕ... خورشیدە بابان

وشەکانی (پڕ) و (گڕ) ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری جودا دروست دەکەن، چونکە لە یەك پیتیان لە یەك جیان.

ـ کە هاتی دونیا گۆڕا

خۆشەویستی لێ چۆڕا

فێرت کردین واتای ژین

چۆن بەرەو بەرزی بچین... قاسم گەلاڵی

وشەکانی (گۆڕا) و (چۆڕا) ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری جودا دروست دەکەن، چونکە لە یەك پیتیان لە یەك جیان.

ـ سەگ بە گورجی گەیشتە سەر ئاوێ

ویستی گەر بسرەوێ لەوێ تاوێ... ئیبراهیمی ئەفخەمی

وشەکانی (ئاوێ) و (تاوێ) ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری جودا دروست دەکەن، چونکە لە یەك پیتیان لە یەك جیان.

ـ دوور لە هاوار

دوور لە جێگا

باری خستبووە لا ڕێگا... حەسیب قەرەداغی

وشەکانی (جێگا) و (ڕێگا) لە پیتی یەکەمیان جیاوازن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست بووە.

ـ من ئەمەوێ لە سێبەرتا بتوێمەوە
من ئەمەوێ هەموو ڕۆژێ،
لەسەر ڕێتا جارێکی کەش بڕوێمەوە... حەسیب قەرەداغی
وشەکانی (بتوێمەوە) و (بڕوێمەوە) تەنها لە پیتی دووەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو ڕووێکەوە وەکو یەکە، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ ئەی بوکی چڵ
ئارامی دڵ
دڵی گەرمت
لە کۆشی خەو
لە دۆڵی شەو
بێدارکەوە...سەعدوڵڵا پەرۆش
وشەکانی (دڵ) و (چڵ)، لە پیتی یەکەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا لە پیتی دووەمیان وەکو یەکن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ تیشکی خۆری ئازادی گەل
دە زووکە زوو
ڕوو نیشاندە لە لێوی کەل
بە ئارەزوو...سەعدوڵڵا پەرۆش
وشەکانی (کەل) و (گەل)، تەنها لە پیتی یەکەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو ڕووێکەوە وەکو یەکە، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروستبووە.

ـ ڕۆیی کاروانی ئەو شەوەی
لێی خەوتبووی
هی ئەو شەوەی
لەژێر باڵی
پاڵ کەوتبووی...سەعدوڵڵا پەرۆش

وشەکانی (خەوتبووی) و (کەوتبووی) تەنها لە پیتی سێیەمیان لە یەك جیانە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی جودا) بەرهەم هاتووە.

ـ چرای پڕ نووری ئازادی، کە زوو
پێغەمبەرەکان هەڵیانکردبوو
تەواو کەوتووە لە تروسکەو گڕ
بە دەس دەسدار و دەسبڕ و دەسپڕ... ئەحمەدی موفتی زادە

وشەکانی (دەسبڕ) و (دەسپڕ) تەنها لە پیتی چوارەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو ڕووێکەوە وەکو یەکە، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ لێم حەرام بێ شیری داکم
گەر تف نەکەم
لەو کەسانەی
هێرش دێنن بۆ سەر خاکم... جەمال گردەسۆری

وشەکانی (داکم) و (خاکم) تەنها لە پیتی چوارەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو ڕووێکەوە وەکو یەکە، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ بۆ مەرگ سەرە ئەگرن
یەك بە دوای یەکا ئەمرن... محەمەد حسێن بەرزنجی

وشەکانی ئەگرن و ئەمرن رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست دەکەن، چونکە هەردووکیان لە تەنها پیتی سێیەمیان لە یەکتری جیاوازن.

ـ لە شەوانا باش دەخەوێ
درەخت لە لەنجەی دەکەوێ... جەوهەر کرمانج
وشەکانی (دەخەوێ) و (دەکەوێ) تەنیا لە پیتی سێیەمیان لە یەك جودا دەبنەوە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست دەبێ.

ـ تۆ چەندە بارێکی قورسی
بەسەر لاشانی غەمەوە
چەمۆڵەیەکی چەند مۆنی
بەنێو چاوانی تەمەوە... مارف ئاغایی
(غەمەوە) و (تەمەوە) دوو وشەن تەنیا لە پیتی یەکەمیان لە یەکتری جودان، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ هەنگ ئەفڕێ
بۆ مژینی هەلاڵەی گوڵ
ڕێ ئەبڕێ... محەمەد ساڵح دیلان
وشەکانی (ئەفڕێ) و (ئەبڕێ) تەنها لە پیتی سێیەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو ڕوویێکەوە وەکو یەکە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ قاسپەی کەوی قەد پاڵی شاخ
وەك دەڕژێتە دامێنی باخ
خۆشترین ئاواز پێکدێنێ
دڵ بۆ نەغمەی خۆش رادێنێ...ئیدریس

وشەکانی (شاخ) و (باخ) تەنها لە پیتی یەکەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو رووێکەوە وەکو یەکە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ سبەی قوتابخانەیە
ڕۆژی خۆشی ئێمەیە
دەڕۆین دەخوێنین بە تاو
زانست و رەوشتی باو... ئیدریس

وشەکانی (تاو) و (باو) تەنها لە پیتی یەکەمیان لە یەکتری جیاوازن، دەنا پیتەکانی تریان لە هەموو رووێکەوە وەکو یەکە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا) دروست دەکەن.

ـ مردن دەرگای دەکاتەوە
وەك چۆن گورگێکی چاوبرسی
بۆ نێچیرێ
زار لە یەکتر دەباتەوە... مارف ئاغایی

وشەکانی (دەکاتەوە) و (دەباتەوە) دوو وشەن تەنیا لە پیتی سێیەمیان لە یەکتری جودان، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ من نامەوێ کوردستانم بێتە کەلاوەی وێرانە
من نامەوێ بیرووخێنن ئەم لانەی بێچووە شێرانە... خوشکە بێخەو

وشەکانی (وێرانە) و (شێرانە) رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری جودا دروست دەکەن، چونکە لە یەك پیتیان لە یەك جیان.

ـ تاکەی کوردستان پارچە و بەش بەش بێ
تاکەی پۆشاکی دایکانمان رەش بێ... خوشکە بێخەو

وشەکانی (بەش) و (رەش) رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری جودا دروست دەکەن، چونکە لە یەك پیتیان لە یەك جیان.

**٢ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی رەها:**

لێرەدا ئەو دوو وشانەی، کە رەگەزدۆزییە ناتەواوەکە دروست دەکەن، لە ژمارەو شێوە و ریزبوون و جۆری پیتەکانیان دەشێ لێکجیابن، بەڵام هەردووکیان یەك رەگیان هەیە.. بۆ وێنە:

ـ بۆ مەرگ سەرە ئەگرن

یەك بە دوای یەکا ئەمرن... محەمەد حسێن بەرزنجی

لە نێوان وشەکانی مەرگ و ئەمرن رەگەزدۆزی ناتەواوی هاورەگەزی هەیە، چونکە هەردووکیان لە چاوگی مردن وەرگیراون.

ـ ماوەیەکە

لە یەکتری دابڕاوین

نا لە یەکیان دابڕاندین... عەبدولڕەحمان بێلاف

وشەی دابڕاو: ئاوەڵناوی کراوە.. وشەی دابڕاند: فرمانی رابردووی تێپەڕکراوە سادەیە.. هەردووکیان لە چاوگی (دابڕان)ەوە دروستبوونە، بەمەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (رەها) دروست دەکەن.

ـ لە تەماشاکردنی هەوری لەکاچوو راهاتووم

دەشزانم بەندەکانی ناو بەندیخانە بۆ پڕ هیوان... سەباح رەنجدەر

وشەکانی (بەندەکان) و (بەندیخانە) دوو وشەن لە نیوەی زیاتری پیتەکانیان لە یەکتری جیاوازن، بەڵام یەك رەگیان هەیە، ئەویش چاوگی (بەندکردن)ە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواو)ی لە جۆری (رەها) دروست دەکەن.

**٣ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد:**

بریتییە لەو رەگەزدۆزییەی، ئەو دوو وشەیەی دروستی دەکەن، جۆر و شێوە و ریزی پیتەکانیان یەك بێ، بەڵام ژمارەی پیتەکانیان ئەوەندەی یەکتر نەبێ، یەکێکیان پیتێك، یان دوپیتی لەوی تر زیاتربێت.. ئەمەش دوو جۆری هەیە:

**یەك:** جاری وا هەیە وشە زیادەکە لە پێشتر دێت و وشە کەمترەکە لە دواوەی دێت، لە یەك دێڕبن، یان لە دێڕی لەیەك جیا.. بۆ نموونە:

ـ لە وەتەی هەم
خەم بە دڵی من ئاشنایە
لێوەکانم
لە زەردەخەنە یاخین و
چاوەکانم
فرمێسکیان کۆتایی نایە... بێلاف

وشەی (ئاشنایە) لە دێڕی دووەم بە دوو پیتی سەرەتای لە وشەی (نایە)ی دێڕی شەشەم زیاترە، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (زیاد) دروست دەکەن.

**دوو:** جاری واش هەیە وشە پیت کەمترەکە دەکەوێتە پێشەوەو وشە پیت زۆرەکە دەکەوێتە دوای ئەو، جا لە یەك دێڕ بن، یان لە دوو دێڕی لەیەك جیا.. بۆ نموونە:

ـ ئەی هەتووانی جەرگی بابە
ئەو بابەی سینەی کەبابە... خدر کۆساری

(باب) و (کەباب) دوو وشەن دووەمیان بە دوو پیت لەوەی یەکەم زیاترە، بەوەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری زیاد) بەرهەم هاتووە.

**چەند نموونەیەکی ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد:**

ـ لەو کەسانەی کوردیان ناوە
شتی وا رووی نەداوە... شێخ نوری شێخ صالح.

وشەی (نەداوە) لە ناوەڕاستیدا بەدوو پیتی (ە) و (د)ی لە وشەی (ناوە) زێترەو (زیاد)ی دروستکردووە.

ـ ئیمشەو هەر خەمەن جە دەروون جەمەن
یانیٚ وەهارەن، ماتەمەن تەمەن... سەباحی جەباری

وشەی (ماتەم) لە سەرەتایدا بە دوو پیتی (م) و (ا)ی لە وشەی (تەم) زێترەو (زیاد)ی دروستکردووە.

ـ ئەنالم ئەڵێم: تۆ وەك ئاوێنەی
بۆ شوێن دەستکردی کردگار وێنەی... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەی (ئاوێنە) بە دوو پیتی سەرەتای لە وشەی (وێنە) زیاترە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

ـ ئەی برادەران با بچینە یاری
نەوجەوانیمان لێ بدا دیاری... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەی (دیاری) بە پیتی (د)ی سەرەتای لە وشەی (یاری) زیاترە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

ـ کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە
چەندە مەڵبەندی ئێمە شیرینە... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەی (شیرینە) بە دوو پیتی سێیەم و چوارەمی لە وشەی (شینە) زیاترە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

ـ لاوانی تازەی کورد وەرن
بەهرە لە ژینمان وەرگرن... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەی (وەرگرن) بە دوو پیتی چوارەم و پێنجەمی لە وشەی (وەرن) زیاترە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

ـ ئەبینم هەرچی بانگی ئەکەمێ
دەمی گیراوە، ئاخ بۆ هاودەمێ... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەی (هاودەم) بە سێ پیتی سەرەتای لە وشەی (دەم) زیاترە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد) دروست بووە.

ـ ئەوەی تەنیا جوڵانەوەی پێ رەوابێ
هەڵگەڕانەوەی زەحمەتە
گەڕانەوەی چەند ساتێکە

پڕ گریان و زەردەخەنە... عەبدولڕەحمان بێلاف
(گەڕانەوە) و (هەڵگەڕانەوە) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیادە.

ـ دنیا باغێکە ژیان گوڵێەتی
ئازادی زادی گەلاَ و چلێەتی...دلزار
(ئازادی) و (زاد) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی لە جۆری (زیاد)یان دروستکردووە.

ـ دەوری خیانەت کەوتووە
هێزی میللەت سەرکەوتووە... عوسمان مستەفا خۆشناو
(کەوتووە) و (سەرکەوتووە) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی لە جۆری (زیاد)یان دروستکردووە، چونکە وشەی دووەم بە سێ پیت لە وشەی یەکەم زیاترە.

ـ هەواڵ نەهات
شەماڵ نەهات
لە بەیانیشا خۆری من
هەر هەڵنەهات!... شێرکۆ بێکەس
(نەهات) و (هەڵنەهات) دوو وشەن، ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد دروست دەکەن، چونکە دووەم بە سێ پیت لە یەکەم زۆرترە، ئەوەش وایکردووە خوێندنەوە ئاسانتر بێت.

ـ لە شەڕی نێوان دار و با
لك زۆرترین زیان دەبا... مارف ئاغایی
(دەبا) و (با) ڕەگەزدۆزی ناتەو لە جۆری (زیاد)ە، چونکە یەکەم بە دوو پیت لە دووەم زۆرترە.

ـ لەو دیو دیوار
کە تاسە ئەیبەستێ قەتار

بۆ دەرەوەی زیندانی تار
هەنگی گیان ئەفڕێ بۆ دوور
بۆ ناو بەهار... **محەمەد صالح دیلان**

(دیو) و (دیوار) و (قەتار) و (تار) رەگەزدۆزی ناتەواوی (زیاد) دروست دەکەن.

ـ لە دووکەڵی گەردەلولی ستەما
لە لێلآیی کەفی بیابانی تەما... لەتیف هەڵمەت

وشەکانی (ستەما) و (تەما) رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (زیاد) دروست دەکەن، چونکە یەکەمیان بە پیتی یەکەمی لە دووەم زۆرترە، دەنا چوار پیتەکانی دیکەی هەردوو وشە، شێوەو ریزبوون و ژمارەیان وەکو یەکە.

**٤ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی:**

بریتییە لە بوونی دوو وشە، ئەگەرچی زۆربەی پیتەکانیشیان لەیەکجیابێ، بەڵام لەسەر یەك کێش بن.. بۆ وێنە:

ـ دارێك هەبوو
داری بەڕوو
پێیان ئەوت: داری ژیان
داری زیندوو... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (هەبوو) و (بەڕوو) ژمارەی پیتەکانیان یەکسانە، هەر یەکەیان چوار پیتن، بەڵام پیتەکانی یەکەم و سێیەمیان لەیەکجیایە، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر یەك کێشن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی) دروست دەکەن.

ـ گوڵ خونچەی شادی
لەناو دەروونی رووناا ئەڕوێ
جریوەی ئازادی
لە تیشکی دیدەی گەشمانا هەڵدێ... عوسمان **محەمەد** هەورامی

وشەکانی (ئەڕوێ) و (هەڵدێ) ژمارەی پیتەکانیان یەکسانە، هەر یەکەیان پێنج پیتن، بەڵام پیتەکانی یەکەم و سێیەم و چوارەمیان لەیەکجیایە، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر یەك کێشن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی) دروست دەکەن.

ـ باوك هاتە دەنگ، گوتی: زانیتان
واتەی پەندەکەی باب و باپیران... بێخەو

لەم دێڕەدا دەبینین هەردوو وشەی: (زانیتان) و (باپیران)، پیتەکانی یەکەم و سێیەم و پێنجەمیان لە یەکدی جیایە، بەڵام هەردووکیان لەسەر یەك کێشن.

ـ بە هێوری دەتوێمەوە
بۆ بەر پێی خۆم دەڕژێمەوە... حەسەنی دانیشفەر

(دەتوێمەوە) و (دەڕژێمەوە) لە پیتەکانی سێیەم و چوارەمیان لە یەکتری جیانە، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ڕەگەزدۆزی ناتەواوی لە جۆری هاوکێشی)یان دروست کردووە.

ـ ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
ئەبێ کۆرپە بەخێو بکا
نە شاخ بکا نە شێو بکا... **محەمەد** ساڵح دیلان

وشەکانی (بەخێو) و (نەشێو) هەردووکیان پێنج پیتن و لەسەر یەك کێشن، بەڵام لە پیتەکانی یەکەم و سێیەمیان لەیەکتری جیاوازن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی) دروست دەکەن.

ـ ئەم شەو
ئەستێرەیەك دەڕژێ
منارەیەك بنکۆڵ دەبێ
زەنگێك دەشکێ... بێلاف

دەڕژێ) و (دەشکێ) ڕەگەزدۆزی ناتەواون لە جۆری هاوکێشی، چونکە لە پیتەکانی سێیەم و چوارەمیان لە یەك جیاوازن، بەڵام لەسەر یەك کێشن.

ـ ئەگەر خوات ناسی بپاڕێرەوە
بە زمانی خۆت بـــــــلالێرەوە... پیرەمێرد.

(بپاڕێرەوە) و (بلالێرەوە) هەردووکیان نۆ پیتن، لە پیتەکانی دووەم و چوارەم لـە یـەکتری جیاوازن، لەسەر یەك کێشیشن، بەمەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی)یان دروستکردووە.

ـ هەر گەلێ ڕێی سەرفیرازی گرتەبەر
تاجی بەرزی و سەربەخۆیی کردەسەر...دلزار

(گرتەبەر) و (کردەسەر) ڕەگەزدۆزی ناتەواون لە جۆری هاوکێشی، چونکە لـە پیتـەکانی یەکەم و سێیەم و پێنجەمیان لە یەك جیاوازن، بەڵام لەسەر یەك کێشن.

ـ ئاڵای ئازادی دەشەکێتەوە
وەك هەموو گەلان دەحەسێتەوە...دلزار

(دەشەکێتەوە) و (دەحەسێتەوە) لە پیتەکانی سێیەم و پێنجـەمیان لـە یـەکتری جیانـە، بەڵام لەسەر یەك کێشن، بۆیە ڕەگەزدۆزی ناتەواوی لە جۆری (هاوکێشی)یان دروستکردووە.

ـ بۆ شەقڵ و مۆرکی دەناڵێ
ڕەندووکی چاوی دەبارێ... خدر کۆساری

(دەناڵێ) و (دەبارێ) دوو وشەن ژمارەی پیتەکانیان بە قـەد یەکـە، بـەڵام لـە پیتـەکانی سێیەم و پێنجەمیان لە یەکتری جیان، بەڵام لەسەر یەك کێشن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی) دروست بووە.

### ٥ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی:

بریتییە لە هەڵگەڕاندنەوەی وشەیەك لە وشەکان، یان بە واتایەکی تـر: ئـەو دوو وشـەیەی (پێچەوانەیی)یەکە دروست دەکەن، وشەی دووەمیـان ریـزی پیتـەکانی پێچـەوانەی ریزبـوونی هەمان ئەو پیتانەیە، کە وشەی یەکەم پێکدێنن... بە واتە:

بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە ژمارەی پیتەکان و جۆری پیتەکانیان وەکو یـەکن، بـەڵام شێوەی پیتەکانیان مەرج نییە وەکو یەك بن، ریزبوونی پیتەکانیشـیان تـەواو بـە پێچـەوانەی

یەکن.. بۆ نموونە: وشەکانی: (حـوور) و (رووح).. وشـەکانی: (شـەڕ) و (ڕەش).. وشـەکانی: (کەو) و (وەك)و بەم شێوەیە.. بۆ نموونە:

ـ نەك هەر خۆمان
بگرە هەتاکو سروشتی
ئاوی، شاخی، تا درەختی
ناو نیشتمان
ئێنە چۆنین لەگەڵ یەکا
ئەوانیش وان!... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (ناو) و (وان) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی دروست دەکەن.

ـ ئەمجارەیان نەکەی بڕۆی
بێدەنگ و کڕ
دەنا ڕکت لێهەڵدەگرم
لێت دەبم بە بڵێسە و گڕ... ئاسۆی عەبدوڵڵا

(کڕ) و (ڕك) ڕەگەزدۆزی ناتەواون لە جۆری (پێچەوانەیی).

ـ ڕەنگە سیمات وەکو هی کەژ
بە ئێوارانی زستانان
تەمێکی قورس دایگرتبێ
ئەو چاوانەت کە دوو کانی ڕوونی نوور بوون
وەکو ئاسکێ کەوا بێچووی ڕاونرابێ
چەند جار جەرگی سووتێنرابێ
لێلاییان داهاتبێ... ئەنوەر قادر محەمەد

وشەکانی (ڕوون) و (نوور) ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (پێچەوانەیی) دروست دەکەن.

ـ تۆ بڵێی ئەمڕۆ
گوڵێکی دیی هەڵوەریبێ؟!

تۆ بڵێی ئەمڕۆ
دڵی ماندووی وەك باڵەکانی کەوێکی سەرپەڕێنراو
هەڵقرچابێ؟!... ئیدریس عەبدوڵڵا

وشەکانی (وەك) و (کەو) دوو وشەن ژمارەی پیتەکانیان بە قەد یەکە، بەڵام ریزبوونی پیتەکانیان لە یەکەتری جیایە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی (پێچەوانەیی) دروست دەکات.

**٦ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی:**

جۆرێکی دیکەی رەگەزدۆزی ناتەواوە، بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە دووەمیان کەرتی یەکەمیانە، واتە: وشەی دووەم لە رووی ژمارەی پیتەکانەوە لە وشەی یەکەم کەمترە، کە ئەوەش وابێت، کەوابێ واتای هەردوو وشەکەش لە یەکتری جیادەبنەوەو هەریەکەیان واتایەکی سەربەخۆی دەبێت، دیارە لێرەدا بە لای هەندێ لە رەوانبێژانی عەرەب و کوردیش مەرج ئەوەیە وشەی کەرتکراو لە پێشەوەو ئەو کەرتە وشەی لێیشی کراوەتەوە راستەوخۆ بەدوای خۆیدا بێتەوە، بێ ئەوەی هیچ وشە و دەستەواژەیەك نێوانییان بکات. وەکو بۆ نموونە: (شارستان شار جێناهێڵێ)، (باغەوان باغەکەی فرۆشت)، (دەنگخۆشەکە دەنگی نووسا)، لە هەموو ئەو نموونانەی پێشوو دەبینین، هەمیشە کەرتە وشەی دووەم بە راستەوخۆیی لە پاش کەرتی یەکەمی هاتووەو واتاشیان جیاو سەربەخۆیە، ئەوەتا لە نموونەی یەکەمدا: وشەی (شارستان) کە بکەرە و گوزارشت لەو کەسە دەکات، کە خەڵکی شارە، یان خاوەن بەها و نەریتە ژیاری و شارستانییە بەرزەکانە، وشەی (شار)ی لێ کراوەتەوە، کە واتایەکی دیکەی هەیە و بریتییە لەو بازێڕە گەورەی دامەزراوەی جۆراوجۆر و دوکان و کۆشك و سەراو فەرمانگە جۆراوجۆرە خزمەتگوزارییەکان و شتانی دیکەی تیایەو بەوە لە گوند جیادەکرێتەوە.

لە نموونەی دووەمیش وشەی (باغەوان) ئاوەڵناوی بکەرە وەکو ناو و بکەر هاتووە، لە دوای خۆی وشەیەکی دیکەی لێ کراوەتەوە، کە ئەویش وشەی (باغ)ە، ناوی ئەو شوێنەیە، کە داری میوەجاتە جۆراوجۆرەکان لەخۆ دەگرێت.

لە نموونەی سێیەمیش، وشەی (دەنگخۆشەکە) وەکو ناوێکی لێکدراوی ناسراو و بکەری رستەکە هاتووە، وشەی (دەنگ)ی لێکراوەتەوە، کە ئەو هێما زمانیانەیە، هەر مرۆڤێك، یان مەخلوقێکیتر دەریدەبڕێت.

له ئەدەبیاتی کوردی و له قسەی ئاسایی خەڵکیش، گەلێ جار ئەو هونەره قسه و دەربڕینەکان جوان و سەرنجڕاکێش و کاریگەر دەکات، ئاوازێکی خۆشیان بۆ دروست دەکات، له شیعری نوێیش گرنگی پێدراوه، له خوارەوه چەند نموونەیەك لەو بارەیه دەخەینه بەرچاو:

ـ هیوا رۆڵه رۆ کۆرپەم رۆڵه رۆ
ئەو کوڵمه ئاڵه نەرم و نۆڵه رۆ... گۆران

وشەکانی (رۆڵه) و (رۆ) رەگەزدۆزی ناتەواوی له جۆری (کەرتی) دروست دەکەن.

ـ له هەڵپەرکێی زەماوەندی خۆرەتاودا
گەییه مەبەست
پەڕەیەکی رێڕەوی رێی
بۆ تەوژمی تێکۆشانی
کاروانی نوێی کانیاوەکان
هەڵدایەوه... موکەڕەم رەشید تاڵەبانی

له نێوان وشەکانی (رێڕەو) و (رێ) رەگەزدۆزی ناتەواوی له جۆری (کەرتی) هەیه.

ـ قەیناکا تۆزێك تۆزی لێ نیشتووه
پیشەی قەدیمه، که جێی هێشتووه... پیرەمێرد

وشەی (تۆزێك) کەرتکراوەو وشەی (تۆز)ی راستەوخۆ له دوا هێنراوەتەوه، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروستکردووه.

ـ داپیره رەقه به تەقه تەقه
زوڵمی زۆردار زۆر ناحەقه... عەزیزی مەلای رەش

وشەی (زۆردار) کەرتکراوەو وشەی (زۆر)ی راستەوخۆ له دوا هێنراوەتەوه، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروستکردووه.

ـ من ئاگردانی ئاگرم
ژان دەمخوات و

برین سەرم تێدەخات و

هەر ناشمرم... جەوهەر کرمانج

لە وشەی (ئاگردان)دا کەرتی یەکەم وەرگیراوە، کە (ئاگر)ەو لە دوای خـۆی هێنراوەتـەوە، بەوەش کەواتە ڕەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروستبووە.

## هێنانەوە:

هێنانـەوە (التصـدیر)، یـان (رد العجـز عـن الصـدر).. بریتییـە لـە بـوونی دوو وشـەی هاوشێوە، یان هاوڕەگەز، یەکیان لە کۆتایی دێڕەکە دێت، ئەوی تریشیان دەکەوێتـە سـەرەتای نیوە دێڕی یەکەم، یان ناوەڕاستی، یان کۆتاییەکەی، یـان سـەرەتای نیـوە دێـڕی دووەم، یـان ناوەڕاستەکەی.. بۆ نموونە:

١ـ هاتنی یەك لە وشەکان لە سەرەتای نیوە دێڕەکە و ئەوی دیکەش لە کۆتایی دێڕەکـە.. بۆ نموونە:

ـ ژین بۆ گەلاوێژ ببوو بە پەرژین

ئێستا لە دوای ئەو بێزارە لە ژین... پیرەمێرد

(ژین) لەم دێڕەدا دوو جار هـاتووە، یەکـەمیان لـە سـەرەتای نیـوەدێڕی یەکـەم و ئـەوی دووەمیشیان لە کۆتایی دێڕەکەدا هێنراوەتەوە.

ـ باڵندەیەك بووم بۆ بەختیاران

جریوەم ئەهات لە لای باڵندان... پیرەبال مەحموود

(باڵندە) لەم دێڕەدا دوو جار هاتووە، یەکەمیان لە سەرەتای نیـوە دێـڕی یەکـەم و ئـەوی دووەمیشیان لە کۆتایی دێڕەکەدا هێنراوەتەوە.

براکانم

من دووکەڵی ئێسکی سووتێنراوی ئێوەم

من دووکەڵی ئێسکی سووتێنراوی ئێوەم

براکانم ... شێرکۆ بێکەس

وشەی (براکانم) لەم کۆپلەیەدا دوو جار هاتووە، یەکەمیان لە سەرەتای کۆپلەکە هاتووەو ئەوی دووەمیشیان لە کۆتاییەکەی هێنراوەتەوە.

ـ بۆ نامناسی
پێم بڵێ بۆ... جەمال گردەسۆری
(بۆ) لەم دوو دێڕەدا دوو جار هاتووە، یەکەمیان لە سەرەتای دێڕی یەکەم و ئەوی دووەمیشیان لە کۆتایی دێڕی دووەم هێنراوەتەوە.

٢ـ هاتنی یەك لە وشەکان لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و ئەوی دیش لە کۆتایی دێڕەکە.. بۆ نموونە:
ـ خوا هاوشانی نییە
هیچ کەش هاوسانی نییە... جەمال بێدار
(نییە) هێنانەوەی دروست کردووە.
لەم دێڕەدا وشە هێنراوەکە (نییە)ە، وشەی یەکەمی کەوتۆتە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و وشەی دووەمیش کەوتۆتە کۆتایی دێڕەکە، بەوەش (هێنانەوە) دروست بووە.

ـ چوومە زمناکۆ راگوزەرگای لەیل
هیچ کەسم نەدی نە شیرین نە لەیل... پیرەمێرد
لەم دێڕەدا وشە هێنراوەکە (لەیل)ە، وشەی یەکەمی کەوتۆتە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم و وشەی دووەمیش کەوتۆتە کۆتایی دێڕەکە، بەوەش (هێنانەوە) دروست بووە.

ـ لە ناو جەنگەڵ لە دەورەی دێ
وا دووبارە دەنگی شـــــــــووم دێ... بێخەو
لەم دێڕەدا وشەی (دێ) کە لە کۆتایی دێڕەکەدا هەیە، لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەمیش هێنراوەتەوە، بەمەش (هێنانەوە) دروستبووە.
شایانی باسە ئەو وشانەی (هێنانەوە) دروست دەکەن، دەشێ هاوواتا بن و، دەشێت بە واتای جیاوازیش هاتبن، وەك لەم نموونەی سەرەوەدا دوو وشەی (دێ)یەکان هەریەکەیان

واتایەکیان هەیە، بەمەش هونەرێکی دیکەی (ڕەوانبێژی)ش بەرجەستە دەکەن، ئەویش بریتییە لە (ڕەگەزدۆزی تەواو)، کە دواتر تیشکی دەخەینە سەر.

٣ـ هاتنی یەك لە وشەکان لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی یەکەم و ئەوی دیش لە کۆتایی دێڕەکە.. بۆ نموونە:

ـ چۆن باست بکەم جوانی بێ پایان
خاکی زێڕینم کوردستانی جوان... بێخەو

لەم دێڕەدا وشەی (جوان) کە لە کۆتایی دێڕەکەدا هەیە، لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی یەکەمیش هێنراوەتەوە، بەمەش (هێنانەوە) دروستبووە.

٤ـ هاتنی یەك لە وشەکان لە سەرەتای دێڕێکی شیعری ئازاد و وشەی دووەمیش لە کۆتایی هەمان دێڕ.. بۆ نموونە:

ـ توخوا بەسە دەی تەبابن
دوور لە ئاژاوەو هەرا بن
سەرگەردانی ماڵوێرانە
لەجێی شادی هەر گریانە
توخوا تاکەی
دەی بەسە دەی... عوسمان محەمەد هەورامی

(دەی) لە دوا دێڕدا لە سەرەتای دێڕەکە هاتووە، لە کۆتاییەکەشیدا هێنراوەتەوە، بەوەش (هێنانەوە)ی دروستکردووە.

ـ کاتی یاری
زۆر توندو تۆڵ
بە هۆشیاری
گۆڵ لەسەر گۆڵ
تۆمار ئەکا... عوسمان محەمەد هەورامی

(گۆڵ) له دێڕی چوارەمدا له سەرەتای دێڕەکه هاتووەو، له کۆتاییەکەشیدا هێنراوەتەوە، بەوەش (هێنانەوە)ی دروستکردووە.

٥ـ هاتنی وشەی یەکەم له سەرەتا و ناوەڕاستی نیوە دێڕی یەکەم وشەی دووەمیش له کۆتایی دێڕەکه.. بۆ نموونه:

ـ وەری وەری یەك دوو

سێ چوار گەڵا وەری... مارف ئاغایی

لەم دێڕەشدا وشەی (وەری)ی یەکەم له نیوە دێڕی یەکەم له سەرەتا و له ناوەڕاستەکەشی هاتووە، دەشێ هەریەکەیان وەربگرین، بۆ جاری دووەمیش له کۆتایی دێڕەکه هێنراوەتەوە.

٦ـ هاتنی وشەی یەکەم له سەرەتا و کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم وشەی دووەمیش له کۆتایی دێڕەکه.. بۆ نموونه:

ـ هەی نائومێدی، هەی نائومێدی

هەی رەنجەڕۆیی، هەی نائومێدی... پیرەمێرد

لەم دێڕەشدا گرێی (هەی نائومێدی)ی یەکەم له نیوە دێڕی یەکەم له سەرەتا و له کۆتاییەکەشی هاتووە، دەشێ هەریەکەیان وەربگرین، بۆ جاری دووەمیش له کۆتایی دێڕەکه هێنراوەتەوە.

٧ـ جاری وا هەیە وشەی یەکەم هەموو دێڕی یەکەم و وشەی دووەمیش له کۆتایی دێڕی دووەم دەهێنرێتەوە، بۆ نموونه:

ـ پەله هەورێ

دەمی نایە دەمی گەرمی پەله هەورێ... بێلاف

لەم دێڕەدا وشەی (پەله هەوێ)ی یەکەم له تەواوی دێڕی یەکەم هاتووە، بۆ جاری دووەمیش له کۆتایی دێڕی دووەمیش هێنراوەتەوە.

ـ من فرمێسکم

بەڵێ بەڵێ من فرمێسکم

لەناو چاوی هەژارانا
لەنگەر دەگرم... کەمال فەرەج تۆفیق
لەم کۆپلەیەدا وشەی (من فرمێسکم)ی یەکەم لە تەواوی دێڕی یەکەم هاتووە، بۆ جاری دووەمیش لە کۆتایی دێڕی دووەمیش هێنراوەتەوە.

٨ـ جاری وا هەیە لە شیعری ئازاددا، وشەی یەکەم لە سەرەتای کۆپلە و وشەی دووەم لە کۆتایی کۆپلەکەدا دەهێنرێتەوە، بۆ نموونە:
ـ خاك نابێ بە ئێمە
نابێ بە خاوەنی ئێمە
دەبێ بگەڕێمەوە بۆ خاك... عومەر سەیدە
(خاك) لە سەرەتای کۆپلە و لە کۆتایی کۆپلەکەش هێنراوەتەوە، بەوەش (هێنانەوە)ی دروستکردووە.

ـ سەرنج بدەن
لە ئەستێرەکەی (داود)دا
شەش بەندیخانەی سێگۆشە
لە ناوەندیا
مانگێکی
دایکی عەرەبی
تیا رەش پۆشە
سەرنج بدەن... شێرکۆ بێکەس
(سەرنج بدەن) لە سەرەتای کۆپلە هێنراوەو لە کۆتایی کۆپلەکەشدا هێنراوەتەوە، بۆ جەختکردنەوەو وەستان لەسەر ئەو واتایەی لەم ناوەڕاستەدا خراوەتەڕوو. ئەوەش هێنانەوەیە.

ـ وەرە خوارێ
سەری ئەستێرەکان مەبڕە
بەری کلاوڕۆژنە مەگرە

ئەی میوانە بچکۆلەکەم
وەرە خوارێ... عەبدوڵڵا پەشێو
(وەرە خوارێ) رستەیەکی سادەیە، لە سەرەتای کۆپلەکە و لە کۆتایی کۆپلەکەش هێنراوەتەوە، بەوەش (هێنانەوە) دروستبووە.

ـ سلاڤ بۆ چیایێ بێخێرێ
سلاڤ بۆ خابیرێ زەلال
هزار هزار ماچ و سلاڤ... سعاد سلێڤانەیی
(سلاڤ) لە سەرەتای پارچەکەو لە کۆتاییشی هێنراوەتەوە، بەوەش (هێنانەوە) دروست بووە.

٩ـ جاری وەها هەیە لە شیعری ئازاددا، وشەی یەکەم لە ناوەڕاستی دێڕێکی کۆپلەو وشەی دووەم لە کۆتایی کۆپلەکە دەهێنرێتەوە، بۆ نموونە:
ـ بڵێ، بە یار بڵێین بە یار یاری نازدار
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار منی هەژار
خۆزگەم بە پار... گۆران
(خۆزگەم بە پار) لە ناوەڕاست و لە کۆتایی کۆپلەکەش هێنراوەتەوە، بەوەش (هێنانەوە) دروستبووە.

ئەمانەی پێشوو هەموویان نموونەی هێنانەوەی هاوشێوەیی بوون، بەڵام هێنانەوەی هاوڕەگەزیش هەیە، ئەویش بریتییە لەو هێنانەوەیەی، ئەو دوو وشانەی دەهێنرێنەوە، هاوشێوە نینە، بەڵام هاوڕەگەزن و یەك بنچینەیان هەیە، بۆ نموونە:
ـ پیاوێکمان ئەمرێ تەعزێی بۆ دەگرین
بۆچ بۆ گەڵاوێژ نەگرین تا دەمرین... پیرەمێرد
لەم دێڕەدا وشەی (ئەمرێ) لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی یەکەم هاتووەو وشەی (دەمرین)یش لە کۆتایی دێڕەکە هێنراوەتەوە، هەردووکیان یەك رەگەز و بنچینەیان هەیە، کە چاوگی (مردن)ە، بۆیە بەمجۆرە هێنانەوەیە دەگوترێت، (هێنانەوەی هاوڕەگەزی).

ـ مەرگی ڕۆژانەم زۆر دیوە
من بۆیە هەرگیز نامرم... عەبدولڕەحمان بێلاف
لەم کۆپلەیەدا وشەی (مەرگ) لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی یەکەم هاتووەو وشەی (نامرم)یش لە کۆتایی دێڕەکە هێنراوەتەوە، هەردووکیان یەك ڕەگەز و بنچینەیان هەیە، کە چاوگی (مردن)ە، بۆیە بەمجۆرە هێنانەوەیە دەگوترێت، (هێنانەوەی هاوڕەگەزی)

## گێڕانەوە:

لە عەرەبیدا (الترديد)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بەکارهێنانی چەند جارەی وشەیەك، یان دەستەواژەیەك بەو مەرجەی هەر جارەی لە پاڵ شتێکەوە هاتبێت.. ئەمەش بە بەرچاوگرتنی ئەو وشەیەی (گێڕانەوە)کە دروست دەکات، بۆ نموونە:

ـ نزار ئەڵێ
بەهار سەوزە
منیش سەوزم... **محەمەد** سالح دیلان

(سەوز) وشەیەکە دووجار لە پاڵ وشەکانی (بەهار) و (منیش) گێڕدراوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

ـ دار ئەمرێ
رووبار ئەمرێ
هەژار ئەمرێ
زۆردار ئەمرێ
مانگ و رۆژ ئەترازێن و ئەبن چۆڵ
مرۆ ئەبنە نیشتەجێی گۆڕستانی چۆڵ... **محەمەد** حسێن بەرزنجی

ئەمرێ چوار جار لە پاڵ وشەکانی دار و رووبار و هەژار و زۆردار گێڕدراوەتەوە، ئەوەش گێڕانەوەیە.

ـ بەم نەزرە سەیرەو بەم قوربانییە
خوا کاری زۆرەو کەس ئاگا نییە... ئەحمەدی موفتی زادە.

(بەم) وشەیەکە پێکهاتووە لە (بە ئەم)، بەڵام (ئە)یەکە کورت بۆتەوەو هەر (بەم) ماوەتەوە، دووجار لە پاڵ وشەکانی (نەزر) و (قوربانی) گێڕدراوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

## چەند جۆرێکی گێڕانەوە:

### ١ـ گێڕانەوەی ئامرازی ئەمری نائاشکرا:

ـ با راپەڕین، با وریا بین
ئێشك بگرین، بە ئاگا بین... بێخەو

(با).. ئامرازی دروستکردنی شێوازی ئەمری نائاشکرایە، جارێك لە پاڵ وشەی (راپەڕین) و جارێکی دیکە لە پاڵ وشەی (وریابین)دا گەڕێنراوەتەوە.

### ٢ـ گێڕانەوەی ناوی واتایی:

ـ ساڵ سووڕایەوە کاتی بــــەهارە
کاتی گوشادی و هەڵمەت و کارە... بێخەو

(کات) کە دوو جار لە پاڵ وشەکانی (بەهار) و (گوشادی و هەڵمەت و کار) گەڕێنراوەتەوە، ناوێکی واتاییە.

### ٣ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی:

#### أـ ئامرازی پەیوەندە (لە):

ـ سا دروودی خودات لەسەر
ئەی ئەو مامۆستا گەورەیەی
لە راستگۆیی
لە دڵسۆزی
لە دڵپاکی
لە خەمخۆری
لە مێژوودا وێنەت نییە... جەلالەدین نەجمەدین

(له) ئامرازی پەیوەندییە، پێنج جار لە پاڵ وشەکانی (راستگۆیی) و (دڵسۆزی) و (دڵپاکی) و (خەمخۆری) و (مێژوو)دا هێنراوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە) دروست بووە.

**ب ـ ئامرازی پەیوەندی (بۆ):**

ـ بۆ رووناکی، بۆ هیوای پیرۆزی گەل
وادەیە ئەمڕۆ، دەبا هەڵمەت بەرین... بێخەو

(بۆ) کە لە پاڵ وشەکانی (رووناکی) و (هیوای پیرۆز)دا دوو جار گەڕێنراوەتەوە (ئامرازی پەیوەندی)یە.

ـ ئەڵێ مردن
ئەڵێ سووتان
ئاوارە بوون
ئەڵێ وڵات بەجێهێشتن
بۆ تۆ و بۆ هاونیشتمانت
بۆ تۆ و بۆ خێزانەکانت
بۆ ناو بەهار
بەهار بەهاری دوانزە مانگ... **محەمەد سالّح دیلان**

وشەی (بۆ) ئامرازی پەیوەندییە، شاعیر پێنج جار لە پاڵ وشەکانی (تۆ) و (هاونیشتمانت) و (تۆ) و (خێزانەکانت) و (ناو بەهار)ی گێڕاوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

**ج ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی (بە):**

ـ بۆیە هەرگیز
ڕۆڵانی کورد
بە کوڕ بە کچ
بە باوەڕێکی ئاگرین
بە خرپەییێکی دڵتەزێن

بەبێ بەزین
لە رووبەری شانۆی خەبات
ئالآینە گڕ
دوژمنانی بێ دەسەلآت...سەعدوڵڵا پەرۆش

لەم کۆپلەیەدا ئامرازی پەیوەندی (بە) پێنج جار لە پال وشەکانی (کوڕ)، (کچ)، (باوەڕێکی ئاگرین)، (خرپەییێکی دلتەزێن)، (بێ بەزین) گێڕدراوەتەوە.

- وەرە روونێ منالّی پیر
بۆی رامێنە بیرکەوە بیر
ژمارەی مەنزومە چەندن؟
ئەستێرەکان چەند ئەوەندن؟
یەك و خالّ دانێ هەزاران
بە ملیۆنان، بە ملیاران
بە بست، بە گەز
بە غار، بە بەز
بە مانگ ، بە سالّ
خالّ دانێ، خالّ
ڕیزیان بکە، بیان کە هاوێر
دەتوانی بیژمێری؟ نەخێر! ... د. عەلی شەریعەتی (و: هەژار موکریانی)

(بە) ئامرازی پەیوەندییە، هەشت جار لە پالّ وشەکانی (ملیۆنان) و (ملیاران) و (بست) و (گەز) و (غار) و (بەز) و (مانگ) و (سالّ) گێڕدراوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە) بەرهەم هاتووە.

## ٤- گێڕانەوەی ئامرازی نەفی:

- خوشك و برایان منیـــش لە لادێ
نە زەویم هەبوو، نە مال و، نە جێ... بێخەو

لە نیوە دێڕی دووەم لە پالّ وشەکانی (زەوی) و (مالّ) و (جێ) سێ جار (نە)ی ئامرازی نەفی گێڕدراوەتەوە.

ـ نە کوکوختییەك

نە پاسارییەك

بۆ سپێدەی من ناخوێنن... عومەر سەیدە

(نـــە) ئـــامرازی نەفییـــە دوو جـــار لـــە پـــاڵ وشـــەکانی (کوکوختییـــەك) و (پاســـارییەك) گێڕدراوەتەوە، بەوەش (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

**٥ـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی و ئامرازی پەیوەندی:**

ـ نە لە تۆ ئەگەم

نە لە خۆم

نە لە مەیلی دڵی پڕ سۆم... ڕێدار سابیر

(نە) ئامرازی نەفییە، و (لە) ئامرازی پەیوەندییە، سێ جار لە پاڵ وشەکانی (تۆ) و (خۆم) و (دڵ) گێڕدراوەتەوە، بەوەش (گێڕانەوەی ئامرازی نەفی و ئامرازی پەیوەنـدی) بەسـەریەکەوە دروستبووە.

**٦ـ گێڕانەوەی ئامرازی لێکدەری مەرجی:**

ـ گەر دەتەوێ

تێنوێتی گیانت بشکێنێ

گەر بە تەمای

تەمی ڕەشی دڵەڕاوکێ

لەسەر دڵت بتارێنی

ئەگەر شەیدایت

ئاسوودەیی

کامەرانی

بۆ خۆت و نەوەو گشت گەلت

بە دەست بێنی

گەر پێت خۆشە

برایەتی و دادپەروەری

بچەسپێنی
ئەوا بڕۆ
دیوەخانی دڵت چۆڵکەو
تەنها قورئانی تیا دانێ... جەلالەدین نەجمەدین

(گەر) ئامرازی لێکدەرە، چوار جار لە پاڵ رستەکانی بەدوای یەکدا هاتوودا گێڕدراوەتەوە، بەوەش (گێڕانەوە) دروست بووە.

**٧ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی پرس:**

ـ کام رەنگ جوانە کام رەنگ جوانە
بۆ لەچك یا دەسماڵی شان یا کولوانە... محەمەد صالح دیلان

(کام) ئاوەڵناوی پرسە، دوو جار لە پاڵ وشەی (رەنگ) گێڕدراوەتەوە.

هەر لەم دێڕەدا: (یا) ئامرازی لێکدەرە دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دەسماڵ) و (کولوانە) گێڕدراوەتەوەو بەوە (گێڕانەوە) دروست بووە.

**٨ـ گێڕانەوەی ئاوەڵفرمانی پرس:**

ـ چەن بە ئاهەنگ چەن سیحراوی
ئەگەڕێ قاز یان مراوی... گۆران

(چەن) ئاوەڵفرمانی پرسە، دووجار لە پاڵ وشەکانی (ئاهەنگ) و (سیحراوی) گێڕدراوەتەوە، بەوەش (گێڕانەوە) دروست بووە.

**٩ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی نادیار:**

ـ هەر سەرگەردان هەر ئاوارە هەر برسی
بۆچی باشە پێت بڵێم با، ئەپرسی... گۆران

(هەر) ئاوەڵناوی نادیارە سێ جار لە پاڵ وشەکانی (سەرگردان) و (ئاوارە) و (برسی) گێڕدراوەتەوە، بەوەش گێڕانەوە دروست بووە.

ـ بەڵام ئێستا لە گشت شوێنێك
هەر شیوەنەو هەر واوەیلا

منی شاعیر یەك شیعریشم بۆ نانووسرێ
دەزانی بۆ؟
(مەزاجی کوردەواریم تێکچووە دەروێش عەبدوڵڵا)... مارف ئاغایی
(هەر) کە ئاوەڵناوی نادیارە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (شیوەن) و (واوەیلا) گێڕدراوەتەوە.

**١٠ـ گێڕانەوەی ئامرازی بانگکردن:**

ـ لە کوێی ئەی شادومانی ئەی هیوای بەرزی ژیانی دڵ!
لە کوێی ئەی تاقە ئەستێرەی بەیانی کامەرانی دڵ! ... بەختیار زێوەر
(ئەی) لە پاڵ شادومانی و هیواو تاقە ئەستێرە سێ جار گێڕدراوەتەوەو جوانییەکی خۆشی بە خوێندنەوە بەخشیوە.

ـ ئەی نازەنین ئەی بەرگ ئەرخەوانی
وتەی گەرمم لەگەڵ تۆیەو ئەیزانی... محەمەد صالح دیلان
(ئەی) وشەی بانگکردنە دوو جار گێردراوەتەوە لە پاڵ وشەکانی (نازەنین) و (بەرگ)دا بەوەش (گێڕانەوە)ی دروست کردووە.

**١١ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی ژمارە:**

ـ مەرد و ئازاو لێهاتووین
یەك دین و دڵ و یەك رووین... جەمال بێدار
ئاوەڵناوی ژمارەیی (یەك) دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دین) و (روو) گێڕدراوەتەوە.

ـ نۆ مانگ نۆ رۆژو نۆ سەعات
چاوەچاوبووی تا نۆرەت هات
ئەتۆش وەکو جوجیلەی مەل
مایتەوە تا هەڵکەوت هەل
تۆکڵت شکاند، پەردەت دڕاند

(نۆ) ئاوەڵناوی ژمارەیە، سێ جار لە پاڵ وشەکانی (مانگ) و (رۆژ) و (سەعات) هاتۆتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە) دروستبووە.

**١٢ـ گێڕانەوەی ئاوەڵفرمانی نادیار:**

ـ پەروەدگارم زیندووە

هەر ئەبێت و هەر بووە... جەمال بێدار

(هەر) ئاوەڵفرمانی نادیارە، لێرەدا جیایە لەوانەی سەروو کە وەسفی ناویان کردبوو، لێرەدا وەسفی فرمان دەکات، بۆیە ئاوەڵفرمانی نادیارەوە گێڕانەوەی دروستکردووە.

**١٣ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی نیشانەی (ئەم ...ە):**

ـ ئەم هەموو خوشك و کوڕە لاوانە

ئەم دایکە پاك و دوور لە تاوانە

شەلالی خوێن کەی هەر بە ئارەزوو

تفوو لە چارەو ئاکارت تفوو...دلزار

(ئەم... ە) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ نزیك، دوو جار لە پاڵ گرێیەکانی یەکەم و دووەم گێڕدراوەتەوە.

ـ کەچی ئەو خوێنە رژاوە

ئەو ئێسك و گۆشتە سووتاوە

ئەو قوڕگە نوزەتیاماوە... **محەمەد** ساڵح دیلان

(ئەو...ە) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ دووری تاك، شاعیر سێ جار لە پاڵ وشەکانی (خوێن) و (ئێسك و گۆشت) و (قوڕگ)ی گێڕاوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

**١٤ـ گێڕانەوەی ئامرازی لێکدەری (یا):**

ـ هەڵسە بڕۆ

دونیا مەیدانی رەهەندە

یا گریان چاوت ماچ دەکا

یا لەسەر لێوت دەپشکوێ
گوڵی خەندە... عەبدولڕەحمان بێلاف
(یا)ی ئامرازی لێکدەر دوو جار لە پاڵ دوو رستەدا گێڕدراوەتەوە.

**١٥ـ گێڕانەوەی فرمان:**

ـ ئەڵێ مردن
ئەڵێ سووتان
ئاوارە بوون
ئەڵێ وڵات بەجێهێشتن
بۆ تۆو بۆ هاونیشتمانت
بۆ تۆ و بۆ خێزانەکانت
بۆ ناو بەهار
بەهار بەهاری دوانزە مانگ... **محەمەد سالّح دیلان**

(ئەڵێ) فرمانێکە شاعیر سێ جار لە پاڵ وشەکانی (مردن) و (سووتان) و (وڵات بەجێهێشتن)ی گێڕاوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

هەر لەو نموونەیەدا: وشەی (بۆ) ئامرازی پەیوەندییە، شاعیر پێنج جار لە پاڵ وشەکانی (تۆ) و (هاونیشتمانت) و (تۆ) و (خێزانەکانت) و (ناو بەهار)ی گێڕاوەتەوە، بەوەش هونەری (گێڕانەوە)ی دروستکردووە.

## گەڕانەوە:

بریتییە لە گەڕانەوەی شاعیر لە سەرەتای دێڕی دووەمیدا، یان لە سەرەتای نیوە دێڕی دووەمیدا، بۆ جەختکردنەوە لەسەر واتای ئەو وشە، یان ئەو وشانەی، لە ناوەڕاست، یان کۆتایی دێڕی یەکەمیدا، یان نیوە دێڕی یەکەمیدا هێناونیەتی، مەبەستیش لەمە تۆخکردنەوەی ئەو وشەیەیە، کە دووبارە دەگەڕێتەوە سەری، جا ئەمەی لەبەر پیشاندانی دەسەڵاتی شیعری خۆی بێت، وەها بکات، یان لەبەر جوانییەك کە بە هۆیەوەی چێژێکی ئەدەبی خۆشتر بۆ شیعرەکەی دروست دەکات، یان بۆ روونکردنەوەی هۆی ئەو بارەی بێ، کە گوزارشتی لێ کردووە، یان لەبەر هەر پێویستی و جوانکارییەکی تر، کە شاعیر بە پێویستی دەزانێت.

شیاوی باسە: (گەڕانەوە) نە نووسەرانی کورد و نە نووسەرانی عەرەبیش ئاماژەیان بۆ نەکردووە، بەڵام وەکو حاڵەتێك لە شیعری کوردیدا، بە لای من گرنگ و جوانە و شایانی ئاماژە بۆ کردنە، چونکە ئەمەش شێوازێکی تایبەتەو لادانە لە باری ئاسایی ئاخاوتن.. بۆیە من وەهای ناودەنێم و دەیخەمە خانەی (جوانکاری وشەیی).. بۆ نموونە:

ـ دەمی بەهار
بەهاری دیارەو دیار
مەست بە بادەی زێڕی گزنگ
کاتی ئاوڕنگ
هەر یەك نمی
لەسەر گیا
هەر حەوت رەنگەکە ئەنوێنێ
ڕێچکەی چیا
بەرگی بەڵەك ئەنەخشێنێ... محەمەد ساڵح دیلان

لە یەکەم دێڕی ئەم پارچەیە، شاعیر باسی (بەهار)ی کردووە، دواتر لە سەرەتای دێڕی دووەم، واتە دێڕی پاشتر یەکسەر جەختی لەسەر (بەهار)ەکە کردۆتەوەو زیاتری روونکردۆتەوە، بەوەش ئەوەی تۆخکردۆتەوە، کە مەبەستی لە (بەهار) کامەیە.

ـ سبەی جیاواز دەبێ لەگەڵ ئەمڕۆ
ئەمڕۆش جیاوازە لەگەڵ دوێنێ
بێگومان دوێنێش جیاوازی بوو لەگەڵ پێرێ
پێرێش لەگەڵ رۆژانی پێش خۆی
هەموو رۆژەکان لەگەڵ یەکدی جیاوازن... عەلی شێخانی

لەم چەند دێڕەی سەروو دەبینین لە کۆتایی دێڕی یەکەم شاعیر باسی لە (ئەمڕۆ) کردووە، لە سەرەتای دێڕی دووەم گەڕاوەتەوە سەر (ئەمڕۆ).. دواتر لە کۆتایی دێڕی دووەم باسی لە (دوێنێ) کردووە، لە سەرەتای دێڕی سێیەم گەڕاوەتەوە سەر (دوێنێ).. هەر لە کۆتایی دێڕی سێیەم باسی لە وشەی (پێرێ) کردووە، لە سەرەتای دێڕی چوارەم گەڕاوەتەوە سەر وشەی (پێرێ).. دواتر هەر لە دێڕی چوارەم باسی لە وشەی (رۆژانی پێش خۆی) کردووە، لە سەرەتای

دێڕی پێنجەم گەڕاوەتەوە سەر وشەی (هەموو ڕۆژەکان). بەوەش (گەڕانەوە)یەکی جوانی دروستکردووە.

### پاتکردنەوە:

(پاتکردنەوە) لە عەرەبیدا (التكرار)ی پێدەڵێن، بریتییە لەوەی شاعیر وشەیەك، یان دەستەواژەیەك، یان رستەیەك بێنێ، چەند جارێك پاتی بکاتەوە، بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی، بەومەرجەی هەموویان واتایان یەك بێت و لە جارێکەوە بۆ جارێکی تر واتایان نەگۆڕێت. بە واتە: نابێت وشە و دەربڕینەکان نە لە ڕواڵەت و نە لە گوزارەدا، هیچ گۆڕانیان بەسەر دابێت.. بۆ وێنە:

ـ لە دوورەوە ناوت بیستووم
ناشارەزا خۆشت ویستووم
گوایە لەگەڵ شیعرەکانم زۆر ژیاوی
شەواهەی شەو تەزووی شیرنیان پێداوی
نەتناسیوم
نەتناسیون
بڕوا بکە نەتناسیوم... عەبدوڵڵا پەشێو

(نەتناسیوم) دووجار لەسەر یەك هاتووەو پاتکراوەتەوە.

ـ کوا ئەو کچەی بیری باوکی چرایەك بوو
شەوگاری درێژی زستان
لە تاریکی کۆختەکاندا
هەر دەسووتاو هەر دەسووتاو تیشکی سۆزی
دەپرژاندە سەر روومەتی سێوەسوورەی وردیلانمان... ئەنوەر قادر محەمەد

(هەر دەسووتا) رستەیەکە دووجار پاتکراوەتەوە، بۆ (بەردەوامیەتی) مەبەست هێنراوەتەوە.

**چەند جۆرێکی پاتکردنەوە:**

یەکەم: پاتکردنەوە بە پێی جۆری پاتکراوەکە، واتە بە پێی کەسایەتی پاتکراوەکە، کە لە نێو رستەدا دەوردەبینێت، دەشێت ئەم جۆرانەی هەبێت:

**١ـ پاتکردنەوەی وشە:**

**أ ـ پاتکردنەوەی وشەی شەکوا**

ـ ئای ئامان ئامان سووتام، خۆشە وەك نوقڵی بادام

رەگی رۆحیان دەرکێشام، لیرەکانیان دەرهێنام... پیرەمێرد

(ئامان) وشەی دەربڕینی داد و شەکوای حاڵە، دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پاتکراوەتەوە.

**ب پاتکردنەوەی ئاوەڵفرمان:**

ـ لەگەڵماندا دێت و دەچێت

هێدی هێدی بەرزمان دەکاتەوە... سەباح رەنجدەر

(هێدی) وشەیەکی سادەیە، ئاوەڵفرمانی چۆنییە، دوو جار لە پاڵ فرمانی بەرزمان دەکاتەوە پاتکراوەتەوە، بەوە (پاتکردنەوەی ئاوەڵفرمان) دروست بووە.

**ج ـ پاتکردنەوەی وشەی نەفی.. بۆ نموونە:**

ـ کە میوان هات سەری ئەبڕین گۆشتەکەی

نەو، نەو، تخوا بابە ئەوە قەت نەکەی... پیرەمێرد

(نەو) وشەی نەفییە، لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو جار پاتکراوەتەوە.

**د ـ پاتکردنەوەی (چاوگ).. وەکو دەڵێت:**

ـ یەکبوونە یەکبوون ئاواتی گەلان

یەکبوونە مایەی ژینی کامەران... بێخەو

(یەکبوون) کە لە سەرەتای نیوە دێڕی یەکەم دووجار بە دوای یەکتردا هاتووە، (چاوگ)ێکی لێکدراوە.

**٢ـ پاتکردنەوەی گرێ.. بۆ نموونە:**

ـ هەوای هاوینە، هەوای هاوینە

ئەمساڵ هاوینمان زۆر لێ بەقینە... پیرەمێرد

(هەوای هاوینە) گرێیەکی ناوییە دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پاتکراوەتەوە.

ـ ڕەنگە ئێستەو ڕەنگە ئێستە

بەڵام دایە، دەزانم تۆ چراوگێکی

لە تاریکی ماڵەکەتدا داگیرساوی

وەکو پەرێزی گڕتێچوو

چاوەڕوانی باراناوی... ئەنوەر قادر محەمەد،

(ڕەنگە ئێستە) گرێیەکە و دوو جار پاتکراوەتەوە، بۆ مەبەستی دەرخستنی چەندین (ڕەنگە ئێستە)ی دی، کە دایکی وەها و وەها بێت.

**٣ـ پاتکردنەوەی ڕستە.. بۆ نموونە:**

ـــ پاتکردنەوەی (ڕستە).. ئەوەش دوو جۆری هەیە، وەکو:

**أـ ڕستەی فرمان ناتەواو.. وەکو دەڵێت:**

ـ ئەی مناڵە قشتەکانی

پێتەختی ئەشق و کارگە و گوڵ

ئەمڕۆ لەچاوم سڵ بکەن

سڵ بکەن

سڵ... (پەشێو)

(سڵ بکەن) ڕستەیەکە لە کۆتاییدا سێ جار پاتکراوەتەوە، جاری یەکەم و دووەم وەکو یەکەو جاری سێیەمیش بە کورتبڕی پاتکراوەتەوەو (بکەن)ەکەی لێکرتێنراوە، بەڵام بە هەمان واتای (سلکردن)یش هاتووە.

ـ دێینەوە، دێینەوە

ئێمە دێینەوە

بەرەو وڵاتێکی وێران

بەرەو شار و شارۆچکەکان

بەرەو گوندە رووخاوەکان... کامەران مستەفا

لە نیوە دێڕی یەکەم (دێینەوە) وەك فرمانێکی رانەبردووی تێنەپەڕە دووجار پاتکراوەتەوە.

ـ بەتەنیا جێم مەهێڵە، بەتەنیا جێم مەهێڵە

ئەمشەو زریان دەمچێنێ، ئەمشەو زریان... رەفیق سابیر

(بەتەنیا جێم مەهێڵە) لە نیوە دێڕی یەکەم و (ئەمشە و زریان دەمچێنێ) لە نیوە دێڕی دووەم، دوو رستەی فرمان تێپەڕن، لەپاڵ بکەر و فرمان تەواوکەری راستەوخۆ و، تەواوکەری بەیاریدە لە یەکەمیان و تەواوکەری راستەوخۆ و ئاوەڵفرمانی کاتی لە رستەی دووەم هاتوون، بەمەش رستەکان لە چاو رستە فرمان تێنەپەڕەکە درێژتر بوونە.

ـ ئاگادارین، ئاگادارین

گۆڕکەری چینی زۆردارین... بێخەو

(ئاگادارین) کە لە سەرەتای نیوە دێڕی یەکەم دووجار بە دوای یەکتردا هاتووە، رستەی راگەیاندنە، فرمانەکەی (ە)ی ناتەواوە بۆ دەمی ئێستا، بەڵام لەبەر ئەوەی بکەر (ین)ی کەسی یەکەمی کۆیە، بە بزوێنی (ی) دەست پێدەکات، بۆیە (ە)یە بزوێنە فرمانەکە مەودای دەرکەوتنی نامێنێت و، رستەکە بەو شێوەیەی لێدێت کە لەبەرچاوە.

**ب ـ رستەی فرمان تەواو.. وەکو دەڵێت:**

ـ لەژێر سەقفێکا کۆڵەکەی نییە

کە رووخا رووخا رووگیری چییە؟... پیرەمێرد

رووخا رستەیەکی سادەیە، پێکهاتووە لە (رووخا)ی فرمانی رابردووی تێپەڕ و بکەرێکی ئەقڵی کە بۆ کەسی سێیەمی تاك دەگەڕێتەوە، ئەم رستەیە لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو جار پاتکراوەتەوە.

ـ هاتم هاتم بۆ مەبـــــــــــــــەستێ
کەس نییە لە رووم بووەستێ... بێخەو
(هاتم) کە لە سەرەتای نیوە دێڕی یەکەم دووجار بــە دوای یــەکتردا هــاتووە، رســتەیەکی راگەیاندنە، فرمانەکەی (هات)ی تێنەپەڕی تەواوە.. (م) بکەری رستەکەیە.

ـ وەك ئەستێرە هاوار ئەکەین
بە ناو گەرووی تاریکییا
ئەجریوێنین
ئەجریوێنین
لە ئاسۆی دەم بەیانییا... ئەژی گۆران
(ئەجریوێنین) رســتەیەکە دوو جــار بــەدوای یەکــدا هێنراوەتــەوە، بــەوەش (پاتکردنــەوە) دروستبووە.

دووەم: بــەڵام بــە پێــی ژمــارەی وشــە، یــان دەســتەواژە و رســتە پاتکراوەکــە، دەشــێت پاتکردنەوەیەکی دوویی، یان سێیی، یان چواری و پێنجی و شەشــی و بــەم شــێوەیە بــە پێــی مەودای دێڕەکە زۆر یان کەم بێت:
١ـ پاتکردنەوەی دوویی.. بۆ نموونە:
ـ دڵ بە پەرۆشە، دڵ بە پەرۆشە
خەبەرێکم بیست دڵ بە پەرۆشە... پیرەمێرد
(دڵ بە پەرۆشە) رستەیەکە دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پاتکراوەتەوە.

ـ دەزگیرانم کۆترێکی دیاربەکرە
حەزی بە چیاو قاسپەی کەو و دەنگی بەفرە
بۆ گواستنەوەی
زنجیرەی چیام قەف قەف بڕی
رۆژ ژمێرم پەڕ پەڕ دڕی... پەشێو

(قەف قەف) و (پەڕ پەڕ) لە نیوە دێڕی دووەم و سێیەمدا، کە دووبارەکردنەوەی یەك وشەن بە دوای یەك هاتوون، هیچ یەکەیان نە خراونەتە پاڵ وشەیەك ئەمەش (پاتکردنەوە)یە.

ـ خوە سست نەکە
وەرە لەزکە
کەڤنە کەڤنە ئەڤ سلاڤە... سعاد سلێڤانەیی

(کەڤن) وەکو وشەیەکی سادە (ئاوڵناوی چۆنی)یە، دووجار بە دوای یەکدا هاتۆتەوە، بەوەش (پاتکردنەوە)ی دوویی دروست کردووە.

٢ـ پاتکردنەوەی سێیی.. ئەو پاتکردنەوەیە، کە وشە پاتکراوەکە سێ جار بە دوای یەکدا دێت، کە لە راستیدا ئەمە سنوورێکی فراوانتری پاتکردنەوەیەو لەوە کەمتر، پاتکردنەوەی دوویییە.. دەرکەوتنی ئەوەش لە سنووری تاکە دێڕدا دەشێ چەند شێوەیەکی هەبێ.. بۆ نموونە:

ـ کەی تۆم دیوە کەی ئەتناسم کەی کەی کەی
دڵداری چی پەیمانی چی حەی حەی حەی... گۆران

(کەی) وشەی پرسی سێ جار بە دوای یەکدا پاتکراوەتەوە، بەوە پاتکردنەوەی سێیی دروستکردووە.

## پاتکردنەوەی ئاسایی و پاتکردنەوەی جەختێنراو:

### یەکەم: پاتکردنەوەی ئاسایی

ئەو پاتکردنەوەیە، کە پاتکراوەکە بە ئاسایی خراوەتە سەر یەك.. بۆ نموونە:

ـ بابە بابە
دایە دایە
تو ئەو خوایە
تاکەی ئەم هەراو هۆریایە... عوسمان محەمەد هەورامی

لە دێڕی یەکەم (بابە) دووجار و لە دێڕی دووەمیش (دایە) دووجار بە ئاسایی خراونەتە سەر یەك و پاتکراونەتەوە.

**دووەم: پاتكردنەوەی جەختێنراو**

نموونەی ئەو جۆرەشیان لەو دێڕەدا بەرجەستە دەبێت، كە تیایدا دەڵێت:

ـ راپەڕین، با راپەڕین

بەرگی سستی دادڕین... بێخەو

(راپەڕین) كە لە سەرەتای نیـوە دێـڕی یەكـەم دووجـار بـە دوای یـەكتردا هاتووەتـەوە، ئامرازی (با) لە نێوانیاندا هاتووەو، چـووەتە سـەر بەشـی یەكـەمی وشـەی دووەم، ئەمـەش (ئامرازێك)ە شێوازی ئەمری نائاشكرا دروست دەكات و، دەبێتـە هۆكارێـك بـۆ جـەختكردن لەسەر ئەو وشەیەی پات دەكرێتەوە.

ـ ئەگەر ئێجگار بیرم دەكەی

تەلێ، تەلێ، تەنیا تەلێ لە نێرگزی مێرگەكانم بۆ بنێرە... ئەنوەر قادر محەمەد

(تەلێ) سێ جار پاتكراوەتەوە، كە لە جاری سێیەمدا جەختی لەسەر كراوەتەوە بە وشـەی (تەنیا)، بەوەش (پاتكردنەوەی جەختێنراو)بەرهەمهاتووە.

**پاتكردنەوەی یەك سەری:**

لێرەدا لە كۆپلەدا، یەك جارو لە یەك بەشی كۆپلە، یـان تاكـە دێـڕدا پاتكردنـەوە ئـەنجام دەدرێت.. بۆ نموونە:

ـ ئۆف ئۆف ئۆف

پایز رەنگی ماتەمە

دنیا تاریك و تەمە

نوری چاوانم كەمە... بێخەو

(ئۆف) وشەی حەسرەتكێشانە، لە لەتـە دێـڕی یەكـەم سـێ جـار پاتكراوەتـەوە، بـەوەش (پاتكردنەوەی یەك سەری) بەرهەمهاتووە.

**پاتكردنەوەی بە دوای یەكداهێنراو:**

لێرەدا لە كۆپلەدا، زیاتر لە جارێـك و زیـاتر لـە بەشـێكی كۆپلەكـە پاتكردنـەوە ئـەنجام دەدرێت.. بۆ نموونە:

بارانی خەمێکی سووری
گڕ تێبەربوو
ورد... ورد لەگەڵ
فرمێسکی دەنگی قەتاری ئاوارەما دێنە خوارێ
ورد
ورد
بەسەر تاڵی زەردی قژی لاواك و حەیرانی
مەم و زینی پەشۆکاوی ئێوارەما دێنە خوارێ... شێرکۆ بێکەس

لەم پارچەیەدا، ورد ورد دووجار بە پاتکراوەیی هاتووە، هەر جارەی لە بەشێکی کۆپلەکەیە، کە بەدوای یەکدا هاتوون، بەوەش (پاتکردنەوەی بە دوای یەکداهێنراو) دروستبووە.

## مەبەستەکانی پاتکردنەوە:

دیارە بۆ زیاتر لە مەبەستێك پەنا بۆ پاتکردنەوە دەبرێت، هەندێ لەو مەبەستانە بریتینە لە:

**١ـ پاتکردنەوە بۆ مەبەستی نەفیکردن:**

ـ بەڵام تەبیعەت هەرگیزا و هەرگیز
بێ رووناکییە بێ بزەی ئازیز... گۆران

(هەرگیز) لە نیوە دێری یەکەمدا دوو جار (پاتکراوەتەوە) بۆ مەبەستی (نەفیکردن) هاتووە.

**٢ـ پاتکردنەوە بۆ مەبەستی دڵنیاکردنەوە:**

ـ تا چاوی یادم بڕ بکا
بەتەنیا نیم
لەگەڵتانم، لەگەڵتانم... ئازاد دلزار

(لەگەڵتانم) بۆ مەبەستی دڵنیاکردنەوەی بەرامبەر پاتکراوەتەوە.

**٣ـ پاتكردنەوە بۆ دەربڕینی داخ و حەسرەت:**

ـ شیعر نییە

ئەوە رۆح و ئەوە گیان و ئەوە لەشی شاعیرێکە

تك تك تك تك

دەتوێتەوەو هیچ کە سێك هەستی پێ ناکا... مارف ئاغایی

(تك) بۆ بۆ دەربڕینی داخ و حەسرەت چەند جارێك پاتکراوەتەوە.

ـ بمانبوورن دلۆپ دلۆپ خوێنی رژاو

مسقاڵ مسقاڵ

گۆشتی لە ئێسقان جیاوەبووی

لەشی شەهیدی نەناسراو... مارف ئاغایی

(دلۆپ دلۆپ) و (مسقاڵ مسقاڵ) بۆ بۆ دەربڕینی داخ و حەسرەت پاتکراونەتەوە.

**٤ـ پاتکردنەوە بۆ دەربڕینی ترس و نیگەرانی:**

ـ هەر کێلەو کێلەو کێل دەڕوێ لە جیاتی گوڵ

من دەترسێم کە گۆڕستان

هەموو خاکمان لێ داگیر کا

هەر خوێنەو خوێنەو خوێن دەڕژێ لە جیاتی ئاو

من دەترسێم خوێن رووبارمان لێ داگیر کا... مارف ئاغایی

(کێلەو کێلەو کێل) و (خوێنەو خوێنەو خوێن) بۆ دەربڕینی ترس و نیگەرانی بە پاتکراوەیی هاتوونەتەوە.

**٥ـ پاتکردنەوە بۆ تۆخکردنەوەی مەبەست لەسەر وەسفکراو:**

ـ ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد

سڵاوت لێ بێ تا ئەبەد... جەمال بێدار

بۆ تۆخکردنەوەی مەبەست لەسەر وەسفکراو، کە پێغەمبەرە (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، (ئەی موحەممەد) بە پاتکراوەیی هێنراوە.

ـ زانین باڵە بۆ سەفاو گەشت
ئەتبا ئەتبا بەرەو بەهەشت... جەمال بێدار
بۆ تۆخکردنەوەی مەبەست لەسەر وەسفکراو کە زانینە، (ئەتبا) بە پاتکراوەیی هێنراوە.

**٦ـ پاتکردنەوە بۆ مەبەستی مەیدانخوازی (تەحەداکردن):**
ـ بەڵام نەخێر
نەخێر نەخێر هەزاران جار
ناتوانن خۆشەویستیمان
دووچاری دەردەسەری کەن
قەت ناتوانن
لە هیوامان بێبەری کەن... عەبدولڕەحمان بێلاف
(نەخێر) بۆ مەیدانخوازی و تەحەداکردن بە پاتکراوەیی هێنراوە.

**٧ـ پاتکردنەوە بۆ شانازی:**
ـ من هەڵەبجەم هەڵەبجەم
لە کۆڕی شەیدایانا
دانسقەو هەڵبژاردەم... عوسمان محەمەد هەورامی
(هەڵەبجەم) لە دێڕی یەکەمدا بۆ دەرخستنی شانازی بەوەی کەوا بەسەر ئەو شارە هات و دروستیش بوویەوە، دووجار بە یەك واتا بە دوای یەك هاتۆتەوە، ئەمەش (پاتکردنەوە)ی دروستکردووە.

ـ ئەڵلا ئەڵلا
لە شکۆی یادی پیرۆزت
وای کە یادت چەند شیرینەو
لەگەڵ خۆی شادی دەهێنێت!! ... جەلالەدین نەجمەدین
(ئەڵلا) دوو جار پاتکراوەتەوە بۆ دەربڕینی سەرسامی و شانازیکردن بە شکۆ و گەورەیی یادی بۆ پاتکراوە، کە (پێغەمبەر)ە، (درود و سڵاوی خوای لەسەر).

ـ له زۆر گۆشەی ئەو وڵاتە قەڵای سەختی زۆردارەکان
لەژێر زەبری هێزی کورددا
رووخێنراوە... رووخێنراوە... کەمال فەرەج تۆفیق

(رووخێنراوە) لە دوا دێڕدا کە پاتکراوەتەوە، بۆ شانازی کردنە، بە رووخانی قەڵای دوژمنان بە هۆی خەباتی کوردان، بۆیە دووجار بە یەك واتا بە دوای یەك هاتۆتەوە، ئەمەش (پاتکردنەوە)ی دروستکردووە.

ـ وەك ئەستێرە هاوار ئەکەین
بە ناو گەرووی تاریکییا
ئەجریوێنین
ئەجریوێنین
لە ئاسۆی دەم بەیانییا... ئەژی گۆران

(ئەجریوێنین) رستەیەکە بۆ شانازی بەخۆکردن، دوو جار بەدوای یەکدا هێنراوەتەوە، بەوەش (پاتکردنەوە) دروستبووە.

**٨ـ پاتکردنەوە بۆ پیشادانی حاڵ:**

ـ ئەزانیٚ یار، خۆی، کام هەژار، رۆژیٚ سەدجار
ئەکا هاوار: خۆزگەم بە پار! خۆزگەم بە پار! ... گۆران

(خۆزگەم بە پار) رستەیەکە بۆ دەربڕینی حاڵ دوو جار بەدوای یەکدا پاتکراوەتەوە، بەوەش (پاتکردنەوە)ی دروستکردووە.

**٩ـ پاتکردنەوە بۆ رەتکردنەوەی بەرامبەر:**

ـ کەی تۆم دیوە کەی ئەتناسم کەی کەی کەی
دڵداری چی پەیمانی چی حەی حەی حەی... گۆران

(حەی) وشەی سەرسوڕمانە، بۆ رەتکردنەوەی بەرامبەر سیٚ جار بە دوای یەکدا پاتکراوەتەوە، بەوەش پاتکردنەوە دروست بووە.

١٠ـ پاتکردنەوە بۆ مەبەستی کورتبوونەوە لەسەر پاتکراوەو جەخت لەسەرکردنەوەی:

ـ گەورەم مەولام
لەم سەر زەوییە
هیچ کەس هیچ کەس
وەك تۆ نەبوو
وەك تۆ نییە!! ... جەلالەدین نەجمەدین
(هیچ کەس) دووجار بۆ جەختکردنەوە لەسەر وەسفی بۆ پاتکراوە پاتکراوەتەوە.

## چەند نموونەیەکی گشتی پاتکردنەوە:

ـ نا نا نا نابێ ئەوهابێ
قسەی بەدکار و درۆزن
بقۆزیەوە
لە گوێت دابێ... جەمال گردەسۆری
(نا) چوار جار پاتکراوەتەوە بۆ مەبەستی نەهی کردن، لە خووێکی خراپ، کە شاعیر بە قێزەونی خستوویەتییەڕوو.

ـ لەسەر ڕێگای کاروانەکەم
بەرەو ئاسۆی ئاواتەکەم
سوورتر
سوورتر
بە هێزی گیان
هەڵمەت بەرم
بۆ لای بارگەی هاوڕێکانم
هەنگاو دەنێم
هەنگاو دەنێم... کەمال فەرەج تۆفیق
سوورتر، دوو جار ، هەنگاو دەنێم، دوو جار پاتکراونەتەوە، پاتکردنەوەی پێ بەرهەمهاتووە.

## جیاوازی نێوان (گێڕانەوە) و (پاتکردنەوە):

(گێڕانەوە) و (پاتکردنەوە) وەك دوو هونەری جوانکاری وشەیی، ئەگەرچی هەردووکیان بریتیی بن لە دووبارە و سێ بارەکردنەوەی وشە، یان گرێ و رستە و دەربڕینەکان، بەڵام ئەم جیاوازیانەشیان هەیە:

ئەو وشەیەی لە (گێڕانەوە)دا چەند جارێك دووبارە دەکرێتەوە، هەر جارەی دەبێت خرابێتە پاڵ وشەیەك، بەڵام ئەو وشەی لە (پاتکردنەوە) دووبارە دەکرێتەوە، ئەگەر هەر چەند جاریش پاتکرابێتەوە، هەر دەبێ لەتەك یەك بێن و نابێت وشەیەك، یان رستە و دەستەواژەیەك جیاوازی بخاتە نێوانیان، بۆ وێنە:

ـ کێ گۆشیکردی؟ کێ پێی گەیاندی

کێ دەرسی دادای؟ کێ تێی گەیاندی...دلزار

لەم دێڕەدا، ئەگەر چی لە هەردوو نیوە دێڕدا (کێ) چوار جار پاتکراوەتەوە، بەڵام نێوانیان هەیە، جارێك خراوەتە پێش (گۆشیکردووی)، جاری دووەم خراوەتە پێش (پێی گەیاندی)، جاری سێیەم کەوتۆتە پێش (دەرسی دادای)، جاری چوارەم کەوتۆتە پێش (تێی گەیاندی).. بۆیە بەم جۆرە دووبارە کردنەوەیە دەڵێن (گێڕانەوە)، واتە دوای ئەوەی وشەیەك سەرەتا بەکار هاتبوو، ئێستا دووبارە پێویستی لە شوێنێکی تر و لە پاڵ وشەیەکی تردا دووبارەی کردۆتەوە.. بەڵام لە نموونەیەکی وەك ئەمەی خوارەوە:

ـ فرمێسك قەتاری بەست و

ڕژایە سەر ئاگردانی لاڕێی ژوان

باری باری... جەوهەر کرمانج

(باری) دوو جار پاتکراوەتەوە و پاتکردنەوەی بە هۆیەوە بەرهەم هاتووە.

## بوونی پێویستە:

لە عەرەبیدا (لزوم ما یلزم)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە وەکیەکی و هاوشێوەهاتنی پیتێك، یان چەند پیتێکی بەر لەو پیتەی، کە لە هۆنراوەدا رەوی (سەروا) و لە پەخشاندا (سەروادار) دروست دەکات، ئەمەش (سەروا) و (سەروادار)ەکان جوان و ڕێکتر دەکات لە شێوە، بۆ سەر زار خۆشتر گۆ دەکرێن، بەر لە گەیشتنمان بە کۆتایی رستە، یان دێڕە شیعرییەکە، دەزانین کۆتاییان بە چی دێت.. بۆ نموونە:

ـ نەشئەیەك بدە بە گیانی مردووم

ڕووناکی چاوی هەوا کوێر کردووم... پیرەمێرد

ئەم دێڕەش دوو وشەکانی کۆتایی، کە کەتوونەتە بەرانبەر یەك بریتینە لە وشەکانی (مردووم) و (کردووم)، ئەوانە وشەی سەروانە، (د) پیتی ڕەوییە، (ر) پێش ڕەوییە و بوونی پێویستەیە، (وو) و (م) پاش ڕەوینە.

## جۆرەکانی بوونی پێویستە:

بە گوێرەی ژمارەی ئەو پیتانەی دەکەونە پێش پیتی ڕەوی و بوونی پێویستە دروست دەکەن، ئەم جۆرانەی بوونی پێویستە هەنە:

١ـ بوونی پێویستەی یەك پیتی: لێرەدا تەنیا یەك پیتی پێویستە لە پێش پیتی ڕەوی دێت.. بۆ نموونە:

ـ خوێندەواری چرای ژینە

سەرچاوەی بیرو زانینە

ڕێگەی ئاواتی شیرینە

هۆشیارییەو ڕاپەڕینە... بێخەو

لەو پارچەیەدا (ن) پیتی ڕەوییە.. (ی) کە لە پێش (ن)ەکە هاتووە (بوونی پێویستە)یە، بۆیە وشەکانی سەروای دێڕەکە (زانینە) و (ڕاپەڕینە) زۆر بە ئاسانی و خۆشی گۆ دەکرێن.

ئەشێ بکرێن

بە هەوێنی گڕی زۆردار

ئەشێ لە کوورەی مردنا

ببن بە کۆتەرەی ئازار

بە قرچەی ئێش

لە کۆتاییشا.. بە چنگێ

لە خۆڵەمێش... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (ئێش) و (خۆڵەمێش) وشەی سەروان، پیتی (ش) ڕەوییە و سەروای دروست کردووە، پیتی ((ێـ)ی پێش سەرواکە، بوونی پێویستەیە.

٢ـ بوونی پێویستەی دوو پیتی: لێرەدا دوو پیتی پێویستە لە پێش پیتی رەوی دێت.. بۆ نموونە:

ـ بەینێکە خولیای حەزوو ئارەزووم
سەرگەرمی کۆڕی بەزم و ئاهەنگە
نەشئەی ئارامی دەروونی تینووم
وەکو تریفەی سەر گۆمی مەنگە... شێرکۆ بێکەس

ئەم دوو دێڕە بە وشەکانی (ئاهەنگە) و (مەنگە) سەوادارکراون، (گـ) پیتی رەوییە، سەروای دروست کردووە، پیتەکانی (ە)و (ن) پێش رەوینە، بوونی پێویستەن، سەرواکەیان تۆکمە و بەهێز کردووە، (ە)ی کۆتایی پاش رەوییە.

ـ بەو ئومێدەی
بەم دیداری یادی بوونە
زیاتر گوڕمان تێبێتەوە
دڵمان زێدەتر لە جاران
بە ئەوینی تۆی خۆشەویست
پڕبێ و گەشبێتەوە... جەلالەدین نەجمەدین

ئەم کۆپلەیە دوو پارچەیە، هەردوو پارچەکان بە وشەکانی (تێبێتەوە) و (گەشبێتەوە) کۆتاییان هاتووە، کە لەمەدا (ت) پیتی رەوییە، دووپیتی پێش (ت)ەکە (ب) و (ئـ)یەکە، پیتانێکن خوێندنەوەی شیعرەکە خۆشتر و ئاسانتر دەکەن، بۆیە بەم پیتانە دەگوترێت (بوونی پێویستە).

## لێیوەرگرتن:

لە عەرەبیدا (اقتباس)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی پەخشان یان شیعر شتێك لە قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، یان هەر گوتە و دەربڕینێکی بەهێز لە خۆ بگرێت، بەڵام مەرج لێرەدا ئەوەیە، کە وەرگیراوەکە، نابێت لە رستەیەکی سادە کەمتر بێت و نابێ ئاماژەش هەبێ، کە ئەو گوتەیە وەرگیراوە.. لە خوارەوە، نموونە بۆ هەندێ لە جۆرەکانی دێنینەوە.

**جۆرەکانی لێیوەرگرتن:**

١ـ لێیوەرگتن لە قورئانی پیرۆز: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە قورئانی پیرۆز، کە لە رستەیەکی تەواوی ئایەتێك کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ کیسەڵ هێلکەکانی بە لم سپارد
بەلایەوە گرنگ نییە
بگەڕێتەوە سەری، یان نا
کوێر و کەڕو لاڵە
لە ئاست ترووکان... سەباح رەنجدەر

(کوێر و کەڕ و لاڵە) وەرگرتنە لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، کە دەفەرموویت: ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَرْجِعُونَ﴾سورەتی پیرۆزی البقرە، ئایەتی (١٨).. ئەوەش ئیقتیباسە.

ـ کاروان بەڕێکەوت بەرەو بەغدایە
خوا بیپارێزێ قادری تیایە
قادر وریایە
جوان و ئازایە
بۆخۆی زینەتی ژیانی دونیایە... ئیدریس

(زینەتی ژیانی دونیایە) واتای بەشێکی ئایەتی ژمارە (٤٦)ی سورەتی پیرۆزی (الكهف)ە، کە تیایدا هاتووە: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَاةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْبَاقِيَاتُ ٱلصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَاباً وَخَيْرٌ أَمَلاً﴾.. شاعیر وەریگرتووە، بە وشەی کوردی و عەرەبی و بە دارشتنی کوردی شیعرەکەی خۆی پێ دەوڵەمەند کردووە.

ـ رۆژگارێکە
هەموو بە دوای ورگی وێڵە
شەوو رۆژ لە تێکۆشانەو
دەسخەڕۆی سەد فڕوفێڵە
﴿هَـٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ ەو

لەوەش سەیرتر

پێمان وایە

هێشتا زووە

بڵێین: تۆبە... ئیدریس

﴿هَـٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾ بەشێکی ئایەتی ژمارە (٥)ی سورەتی پیرۆزی (ص)ە، کە تیایدا هاتووە: ﴿أَجَعَلَ ٱلْآلِهَةَ إِلَـٰهاً وَاحِداً إِنَّ هَـٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾.. شاعیر بێ ئاماژەدان لە درێژەی قسەکانی خۆی، هێناویەتی و شیعرەکەی پێ دەوڵەمەند کردووە.

٢ـ لێیوەرگرتنی بە فەرموودە: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درود و سلاوی خوای لەسەر)، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ لەسەرمە جێی بێنم تا هەم

کە: (من لا یرحم لا یرحم) ... خدر کۆساری

(من لا یرحم لا یرحم) فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (درود و سلاوی خوای لەسەر)، شاعیر بەم دێڕەی خۆی تێکەڵکردووە، بەوەش لێیوەرگرتن (ئیقتیباس) بەرهەم هاتووە.

٣ـ لێیوەرگرتن لە چەمکێکی ئایینی: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە چەمکێکی ئایینی، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ ئەنجامی درۆ وایە

درۆزن دوژمنی خوایە... مەدحەت بێخەو

(درۆزن دوژمنی خوایە) پوختەی بیر و رێنماییەکانی ئایینی ئیسلامە، وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە نەفرەت لە کەسانی درۆزن کراوە، بۆیە زانایان ئەوەی لە دەقە قورئانییەکە گەیشتوون، هێناویانە لەوەیان پوخت کردۆتەوە، کە دەڵێت: (درۆزن دوژمنی خوایە).

٤ـ لێیوەرگرتن لە پەندی پێشینان: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر پەندێکی پێشینان، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ لە زاڵم چاکە ناوەشێتەوە

گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە... پیرەمێرد

(گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێتەوە ) پەندێکی پێشینانە، شاعیر وەریگرتووەو هێناویەتی ئەو دێڕەی خۆی پێ بەهێز کردووە.

ـ لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە

جەردە رووتت کا با لەوبەرەوە... پیرەمێرد

لە نیوە دێری یەکەم ( لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە ) پەندیکە شاعیر وەریگرتووەو بە شیعرەکەی خۆی تیهەڵکردووە.

٥ـ لێیوەرگرتن بە گوتەی ئامادە: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر گوتەیەکی ئامادە، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ برای دووەم ماڵـــــــــــــی دزرا

سۆراغ نەکراو ئاو و ئاو چوو... مەدحەت بێخەو

(ئاو و ئاو چوو) قسەی سەر زاری خەڵکە، شاعیر بەبێ دەستکاری وەریگرتووەو بە هۆنراوەکەی خۆی تێکەڵ کردووە.

٦ـ لێیوەرگرتن لە شیعر: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە شیعری یەکێکی تر، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ بەڵام ئێستا لە گشت شوێنێك

هەر شیوەنەو هەر واوەیلا

منی شاعیر یەك شیعریشم بۆ نانووسرێ

دەزانی بۆ؟

(مەزاجی کوردەواریم تێکچووە دەروێش عەبدوڵڵا)... مارف ئاغایی

(ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی گیانی بێگانە

میزاجی کوردەواریم تێکچووە دەروێش عەبدوڵڵا)... ئەمە دێڕە شیعرێکی (گۆران)ی شاعیرە، شاعیر بەبێ دەستکاری لەتی دووەمی وەرگرتووەو بە هۆنراوەکەی خۆی تێکەڵ کردووە.

ـ (محەمەد دیتن و موسا شنەوتن
شنەوتن کەی دەگاتە ئاستی دیتن)؟!
منیش ئێستا لاو نیم
خورتێکی بەتاو نیم
بۆیە لەبەرچاو نیم...دلزار

لێیوەرگرتنە بە شیعر، کە دوو نیوە دێڕەکەی یەکەم وەکو شاعیر ئاماژەی بۆ کردووە، لە شیعرێکی فارسیی وەرگێڕاوەو بە شیعرەکەی خۆی تێکەڵکردووە، بەڵام لە ناو هۆنراوەکەی ئاماژەکەی دیار نییەو یەکسەر وەریگرتووە، بەوەش لێیوەرگرتن بەرهەم هاتووە.

ـ خۆزیا لاوێتیم دەگەڕایەوەو پێم رادەگەیاند
کە پیری چی کرد؟ چ ئازارێکی بە گیانم گەیاند!
بەڵام لاوێـی هەرگیزاو هەرگیز ناگەڕێتەوە
بەردیش کە بخزێ تازە شوێنی خۆی ناگرێتەوە...دلزار

دێڕی یەکەم وەرگێڕدراوی دێڕە شیعرێکی بەناوبانگی ئەدەبی عەرەبییە، کە بەم شێوەیە:
الا ليت الشباب يعود يوما
فاخبره بما فعل المشيب

شاعیر وەریگرتووە، وەریگێڕاوەتە سەر کوردی و کوردییەکەی بە شیعرەکەی خۆی تێکەڵکردووە.

ـ دەبارێ وا دەبارێ
بەفر گەییە گۆی دارێ
ماڵمان لە پشت حەوت کێوە
چوار دەورمان گورگ و خێوە... ئازاد دلزار

لێیوەرگرتنە بە شیعر، کە دوو نیوە دێڕەکەی یەکەم:
ـ دەبارێ وا دەبارێ
بەفر گەییە گۆی دارێ

له شیعری سەرزاری وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکەڵکراوە، بەڵام ئاماژەی دیار نییە و یەکسەر وەریگرتووە، بەوەش لێیوەرگرتن بەرهەم هاتووە.

ـ بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
بەرانبەر جوانیت دەرژێ ئەسرینم
جوانیم بۆچییە؟
کە من غەمبار بم
دڵ بریندار و زۆر بە ئازار بم... جەمال گردەسۆری

(بەهار نامەوێ جوانیت ببینم) هی (بێکەس)ە، شاعیر لێیوەرگرتووەو بەو شیعرەی خۆی تێکەڵ کردووە.

ـ لە تێنوێتی ئەم ڕێگایەی
بە خوێنی ئێمەو هەزاران
ملیۆنەها مرۆڤ مەستە
(وێڵین بە دوای ڕێبوارێکا
کلیلی کردنەوەی دەرگای
هیوای ئەم گەلەی لە دەستە) ...عوسمان مستەفا خۆشناو

سێ دێڕەکانی نێو کەوانە هی شاعیر (فەرەیدون عەبدول)ە، شاعیر لێیوەرگرتووەو بەو پارچەیەی خۆی تێکەڵکردووە.

ـ هەر چەند ئەزانم
کە بای هەناسەم
تۆزی خەرمانی خەمی دەروونم
بۆ ئێوە دێنێ
بەڵام گوێ بدەنە
ئاهەنگی دڵی ماندووم کە دەڵێ:
(هەی لایە لایە ڕۆڵە لای لایە

ده بنوو، درەنگە، بۆ خەوت نایە) ... مارف ئاغایی

دوو دێڕی دوایی هی هۆنراوەیەکی فۆلکلۆری سەرزارییە، شاعیر بێ ئاماژەدان وەریگرتووە و شیعرەکەی خۆی پێ دەوڵەمەند کردووە.

## تێکهەڵکێش:

(تێکهەڵکێش) لە عەرەبیدا (**التضمین**)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە تێکهەڵکێش کردنی رستە و گوتەی یەکێکی تر بەو هۆنراوەیەی شاعیرێك لە نوێ دایدەرێژێت، جا گوتە و رستەکە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بێت، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویست بێت (درود و سلاوی خوای لەسەر)، یان پەندێکی پێشینان، یان نیوە دێڕ و دێڕە هۆنراوەی شاعیرێکی تر، یان تەنانەت شیعرێکی تەواوی شاعیرێکی تر، یان هەر دەربڕینێکی تربێت، بەو مەرجەی لە سنووری رستەیەکی سادە کەمتر نەبێت و ئاماژەش هەبێت، کە ئەم رستەیە وەرگیراوەو بەشێکی دیکە نییە لە گوتاری خودی شاعیرەکە.

ئەم هونەرە یەکێکە لە هونەرە وشەییە دەوڵەمەندەکانی (جوانکاری)، چ ئەوانەی لەسەر کێشی عەموودی، چ ئەوانەی لەسەر کێشی ئازادیش شیعریان هۆنیبێتەوە، لە شیعرەکانیاندا بەرجەستە دەبێت، هەروەها لە (پەخشان)یش نووسەر پەنای بۆ دەبات، نووسەر زۆرجار وتەکانی خۆی لەم رێگەیەوە بە وتەی کەسانی تر بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

فەرمووت: (لە ئادەمن گشت)

ـ گەورەو بچوك وردو درشت ـ

(ئەویش بۆ خۆی لە خاکە)

ئیتر هەر چاکە چاکە... مەلا عەبدی

تێکهەڵکێش بە فەرموودەی پێغەمبەرە (درود و سلاوی خوای لەسەر)، شاعیر فەرموودەی ((کلکم من أدم وأدم من تراب))ی وەرگرتووە، وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کە لە دوو رستەدا کورتبۆتەوە، هەر رستەیەی بە جارێك بە شیعرەکەی تێکهەڵکێش کردووە.

## جۆرەکانی (تێکهەڵکیش):

١ـــ تێکهەڵکێشی (قورئانی پیرۆز): لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە.. بۆ نموونە:

ـ خودا فەرموویەتی زوو
﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾

بەڵێ خوا دەبێ وابێ

چۆن دەبێ بێ لە وێنەی... ئیدریس

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ بەشێکی ئایەتی ژمارە (١١)ی سورەتی پیرۆزی (الشورى)یە، کە تیایدا هاتووە: ﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَاوَاتِ وَٱلأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَمِنَ ٱلأَنْعَامِ أَزْواجاً يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾.. شاعیر خۆی ئاماژەی داوە، کە ئەمە لە قورئانی پیرۆزە، ئینجا بە هۆنراوەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

٢- تێکهەڵکێشی (فەرموودە): لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوە و بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، فەرموودەیەکی پێغەمبەری سەروەرە (درود و سڵاوی خودای لەسەر).. بۆ نموونە:

ـ بەڵێ قوربان

یەکەم کەس بووی تێتگەیاندین

ئافرەت لەسەر شانۆی ژینا

خوا رۆڵی گەورەی پێداوە

پایەدارە، خاوەن رێزە

بە هاوەڵانت دەفەرموو:

(چاك بن لەگەڵ ئافرەتانا

چاکترینتان ئەوەتانە

لەگەڵ هاوسەریدا چاك بێ

زۆر بە لەبزو نەرم و نیان و دڵپاك بێ

ئافرەتان هاوتای پیاوانن) ... جەلالەدین نەجمەدین

ئەم دەربڕینانەی نێو کەوانە، هی (پێغەمبەر)ی خۆشەویستن (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، کە لە بارەی پلە و پایەی ئافرەتان و چۆنیەتی مامەڵکردنی پیاوان لەگەڵیاندا فەرموویەتی و پیاوانی لێئاگادارکردۆتەوە، شاعیر وەریگرتوون و دوای وەرگێڕانە سەر کوردییان خستوونەتییە ناو شیعرەکەی خۆی، بەوەش (تێکهەڵکێش) بەرهەم هاتووە.

٣ـ تێکهەڵکهێشکردن بە شیعرێکی تر: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، دێڕ، یان بەشێکی شیعری شاعیرێکی دیکەیە.. بۆ نموونە:

ـ ئێجگار تامەزرۆی لیقاین و
ساتێك چۆکدادان لە حوزوور
وەکو بێخود بە زمانی حاڵ
ناڵەو فوغانمانە لە دوور:
(هەروەك منداڵە کوردێ
کە ون بووبێ لە باوکی
ئەگریم بەرەو مەدینەو
هەر باوە باوەمە)... جەلالەدین نەجمەدین
(هەروەك منداڵە کوردێ
کە ون بووبێ لە باوکی
ئەگریم بەرەو مەدینەو
هەر باوە باوەمە).. ئەم پارچەیە، لە بنجدا دێڕە شیعرێکی (بێخود)ی شاعیرە، ئەو گوتوویەتی:

ـ وەك منداڵە کوردێ کە ون بووبێ لە باوکی
بەرەو مەدینە دێم و هەر باوە باوەمە... بێخود
شاعیر بە دەستکارییەکی کەم وەریگرتووەو خستوویەتییە نێو پارچەکەی خۆی، بەوەش (تێکهەڵکێش)ی دروستبووە.

٤ـ تێکهەڵکهێشکردن بە گوتەی ئامادە: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، گوتەیەکی سەرزاری نێو بازاڕە.. بۆ نموونە:

ـ ئەمشەو بینیم
بۆ هەمیشە لێك هەڵبڕاین
دەڵێن: خەون
بە پێچەوانەی راستییە... مارف ئاغایی

(خەون بە پێچەوانەی راستییە)، گوتەی ئامادەی بیری مرۆیە، شاعیر وەکو خۆی وەریگرتووەو بە ئاماژەدان بەوەی ئەمە وەرگێڕاوە، شیعرەکەی خۆی پێ دەوڵەمەندکردووە، ئەوەش تێکهەڵکێشە بە گوتەی ئامادە.

٥ـ تێکهەڵکێشی بە پەندی پێشینان: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگێڕاوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، پەندێکی پێشینانە.. بۆ نموونە:

ـ خوەزی خوەزی
برێندار بای
بۆ برینا تە
ئەز دەرمان بام
هیڤیا تە ب ژی
دیتنا من با
خوەزی خوەزی
باوەڕناکەم
شێن نەبییە، دارا خوەزی... سعاد سلێڤانەیی

(شین نەبییە، دارا خوەزی) پەندێکی پێشینانە، شاعیر خستوویەتییە ناو شیعرەکەی خۆی، بەوەش (تێکهەڵکێش بە پەندی پێشینان) بەرهەم هاتووە.

ـ نەزیلەی باپیران وایە
شەو بۆ مێران وەك قەڵایە... سوارەی ئیلخانی زادە

(شەو بۆ مێران وەك قەڵایە) پەندێکی پێشینانە، شاعیر خستوویەتییە ناو شیعرەکەی خۆی، بەوەش (تێکهەڵکێش بە پەندی پێشینان) بەرهەم هاتووە.

ـ خۆ دەزانم
ئێستاش چاوی پەشیمانیت لە گریانە
بەڵام چی بکەین، چی بکەین گیانە
نەتزانیوە

له جێی قوزەڵقورت سندانە... جەمیل ڕەنجبەر

(له جێی قوزەڵقورت سندانه) پەندێکی پێشینانه، شاعیر خستوویەتییە ناو شیعرەکەی خۆی، بەوەش (تێکهەڵکێش بە پەندی پێشینان) بەرهەم هاتووە.

٦ـ تێکهەڵکێش بە قسەی نەستەقی پیاوە ئاقڵەکان: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، قسەی نەستەقی پیاوە بە ئەزموون و بە تەمەنەکانە.. بۆ نموونە:

ـ بیستوومە لە کۆنە پیاوان

سەرگوزشتەی خاوەن ناوان

لە سەخڵەتا خۆش دیارن

هەر زۆرەکوژەی زۆردارن... سوارەی ئیلخانی زادە

لەم پارچەیەدا دێڕی دووەم:

لە سەخڵەتا خۆش دیارن

هەر زۆرەکوژەی زۆردارن

وەسفی پیاوە ئاقڵەکانە بۆ ناوداران کردوویانە، شاعیر وەریگرتووەو بە شیعرەکەی تێکهەڵکێش کردووە.

٧ـ تێکهەڵکێش بە وتەکانی ژیان: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، وتەکانی ژینە.. بۆ نموونە:

ـ بەهێز ئەبێ بێهێز بخوات

مێژوو ئەڵێ: ژین وا ئەڕوات... شێرکۆ بێکەس

(ژین وا ئەڕوات) وتەیێکی ژیانە، شاعیر خستوویەتییە ناو شیعرەکەی خۆی، بەوەش (تێکهەڵکێش بە وتەی ژیان) بەرهەم هاتووە.

**دوو سەروا:**

لە ڕەوانبێژی عەرەبیدا (التشريع)ی پێدەڵێن.. ئەم هونەرە تایبەتە بەشیعر.. بریتییە لە بوونی دوو (سەروا)ی لەیەك کات بۆ هۆنراوەیەك.. کە دەشڵێین دوو (سەروا)ی لە یەك کات بۆ

هۆنراوە، مەبەستمان ئەوەیە، ئەگەر بۆ نموونە ژمارەی بڕگەکانی دێڕە هۆنراوەیەك (١٣) بڕگەبێ، لە کۆتایی بڕگەی هەشتەمی دێڕەکە و هەتا کۆتایی هۆنراوەکەش لەو شوێنە بە شێوەیەك هۆنراوەکە سەروادار بکرێت، کە ئەمە (سەروا)ی یەکەمی هۆنراوەکەیە.. ئینجا ئەو پێنج بڕگەیەش، کە لەهەر نیوە دێڕێك و تا کۆتایی هۆنراوەکە دەمێنێ، دووبارە بە شێوەیەکی تر ئەوەش سەروادار بکرێت، ئەمەش سەروایەکی دووەمی هۆنراوەکەیەو بەو شێوە هۆنراوانە، کە ئاوا سەروادار دەکرێن، دەگوترێت هۆنراوەی (دوو سەروا)یی.. بۆ وێنە:

ـ لە سەمای بەرزی ناوبانگی حوسنا
تاقە ستارە
نەبووی لە وەرزی دەستکورتی منا
ئاشکراو دیارە
هەر لەبەر ئەوە رووم لێ وەرگێڕای
یەکەم تەصادوف
دڵەی حەساس نا بەردم پیشان دای
بەڵام تەئەسسوف!! ... گۆران

ئەم شیعرە هەر دێڕێکی لە بەشی یەکەم سەروایەك و لە بەشی دووەمیش سەروایەکی دیکەی هەیە، دەکرێ ببێتە دوو شیعری بەم شێوەیە:

ـ لە سەمای بەرزی ناوبانگی حوسنا
نەبووی لە وەرزی دەستکورتی منا
هەر لەبەر ئەوە رووم لێ وەرگێڕای
دڵەی حەساس نا بەردم پیشان دای... گۆران

ئەم پارچەیە سەروای دێڕی یەکەمی لە وشەکانی (حوسنا) و (منا) دایە، (ن) پیتی رەوییە، (ا) پاش رەوییە.. دێڕی دووەمیش سەرواکەی لە وشەکانی (وەرگێڕای) و (دای) دایە، (ا) پیتی رەوییە، (ی) پاش رەوییە.

ـ تاقە ستارە
ئاشکراو دیارە
یەکەم تەصادوف
بەڵام تەئەسسوف!! ... گۆران

هەرچی ئەو پارچەی دووەشەمە، ئەویش سەروای دێڕی یەکەمی لە وشەکانی (ستارە) و (دیارە) دایە، (ر) پیتی رەوییە، (ە) پاش رەوییە.. دێڕی دووەمیش سەرواکەی لە وشەکانی (تەصادوف) و (تەئەسسوف) دایە، (ف) پیتی رەوییە.. بەوەش (جووت سەروا)ی دروستکردووە.

ـ دایە گیان لەم دیو شوورە بەرزەکە
واقت وڕماوە
دوو چاوت لەنێو سینگی ئاسۆکە
گۆمی خوێناوە
گوێت لە ئاوازی کەمانی مردن
وا حەپەساوی
لێی ئەدا بەتین دەستڕێژی دوژمن
بۆیە شێواوی... عوسمان مستەفا خۆشناو

ئەم پارچە شیعرە هەر دێڕێکی لە بەشی یەکەم سەروایەك و لە بەشی دووەمیش سەروایەکی دیکەی هەیە، دەکرێ ببێتە دوو شیعری بەم شێوەیە:

ـ دایە گیان لەم دیو شوورە بەرزەکە
دوو چاوت لە نێو سینگی ئاسۆکە
گوێت لە ئاوازی کەمانی مردن
لێی ئەدا بەتین دەستڕێژی دوژمن... عوسمان مستەفا خۆشناو

ئەم پارچەیە سەروای دێڕی یەکەمی لە وشەکانی (ئاسۆکە) و (بەرزەکە) دایە، (ك) پیتی رەوییە، (ە) پاش رەوییە.. دێڕی دووەمیش سەرواکەی لە وشەکانی (مردن) و (دوژمن) دایە، (ن) پیتی رەوییە.

ـ واقت وڕماوە
گۆمی خوێناوە
وا حەپەساوی
بۆیە شێواوی... عوسمان مستەفا خۆشناو

هەرچی ئەو پارچەی دووەمەشە، ئەویش سەروای دێڕی یەکەمی لە وشەکانی (وڕماوە) و (خوێناوە) دایە، (و) پیتی رەوییە، (ە) پاش رەوییە.. دێڕی دووەمیش سەرواکەی لە وشەکانی (حەپەساوی) و (شێواوی) دایە، (و) پیتی رەوییە، (ی) پاش رەوییە.. بەوەش (جووت سەروا)ی دروستکردووە.

**دواخستن:**

بریتییە لە دواخستنی بەشی دووەمی گوتە، کە لە پاشان و لە شوێنێکی دیکە دەخرێتەڕوو، ئەوەش جوانییەك بە دەربڕین دەبەخشێت و چێژێکی خۆشی لێ بەرجەستە دەبێت.. لەم بارەیەوە (مارف ئاغایی) نموونەی جوانی هەیە، لەوانە:

ـ چەند رۆژێکە کۆڵی گریانێکی خەستم هەڵگرتووەو

هیچ دڵپڕێك

چەند مانگێکە گەرووم پڕە لە ئاواز و

هیچ بیسەرێك

چەند ساڵێکە دیوانم پڕە لە شیعر و

هیچ خوێنەرێك

نادۆزمەوە

کە فرمێسك و ئاواز و شیعرم جێ بێڵم... مارف ئاغایی

لەم کۆپلەیەدا دەبینین، کە خوێنەر رستەی یەکەم دەخوێنێتەوە: (چەند رۆژێکە کۆڵی گریانێکی خەستم هەڵگرتووەو)، دەگاتە دەستەواژەی (هیچ دڵپڕێك)، ئەم دەستەواژەیە دیارە بکەری رستەی بەدوا داهاتووە، کە رستەی وەڵامی مەرجە، چونکە رستەی پێشوو رستەی فرمانی مەرجە، بەڵام کە درێژە بە خوێندنەوە دەدات، دەبینێ، شاعیر وەڵامی مەرج دوا دەخات و رستەیەکی دیکەی مەرجی دەکاتەوە: (چەند مانگێکە گەرووم پڕە لە ئاواز و) دیسانەوە دەگاتە سەر دەستەواژەی (هیچ بیسەرێك)، کە ئەوەش بکەری رستەی وەڵامی مەرجی ئەم رستە مەرجەی دووەمەیە، بۆیە خوێنەر دیسانەوە چاوەڕوانی فرمانی مەرجە، بەڵام دیسانەوە شاعیر ئەو فرمانە دوا دەخات و رستەی سێیەمی مەرجی دەکاتەوە، دەڵێت: (چەند ساڵێکە دیوانم پڕە لە شیعر و هیچ خوێنەرێك)، ئینجا فرمانێك دێنێ، ئەوەی لە دوو قۆناغەکانی پێشوو دوای خستبوو، بۆ هەر سێ ئەو رستانەی سەرووی دەکاتە فرمانی مەرج و

دەڵێت: (نادۆزمەوە، کە فرمێسك و ئاواز و شیعرم جێ بێڵم)!! بەمەش ئینجا واتای مەبەست روون دەبێتەوەو خوێنەر تێدەگات مەبەستی شاعیر لە سەرەتاوە چی بووە، ئەوەش (دواخستن)ە، جوانییەکی ئەدەبی و چێژێك پێشکەش دەکات.

ـ ئەوا من هەمیشە لەژێر تریفەی مانگی تەنیا
لەژێر منارە چۆلەکەی شاری غوربەت
لە پەنجەرەو لە تەك ئاسەوارەکانی مەچکۆ
لەبەر دەرگای قەڵا وەهمکوژەکانی شار
لە لای پەیکەرەکەی زەعیم
لەکن ئاوەکەی کەسك و سۆر
لەلای قەسرەکەی عەتاوڵا
لە مزگەوتی شێخی چۆلی
وەستاوم و گوڵم پێیە... کەریم دەشتی

لەم پارچەیەدا شاعیر حەوت رستە دێنێ، هەموویان یەك فرمانیان دەوێت بۆ ئەوەی تەواوبن، بەڵام هیچیان تەواو ناکات و ئەو فرمانانەیان پێنادات و دوای دەخات، تا لە کۆتاییدا لە رستەی هەشتەم، ئینجا فرمانەکە دێنێ و واتای هەموو ئەوانەی پێشوو بەو فرمانە دەبەستێتەوە.

**سەرواداری موتریف:**

لە (**سجع المطرف**)ی عەرەبی وەرگیراوە.. جۆرێکە لە سەروادار، ئەوەیە کە وشە کۆتاییەکانی رستە، یان لەتەدێڕ هاوکێش نەبن، بەڵام هاوسەروا بن.. بۆ نموونە:

ـ بام بۆ زۆرداران بچەوسێمەوە
با لە بێگاران نەحەسێمەوە
شپرزە نابم هەڵئەسێمەوە... بەختیار زێوەر

وشەکانی (بچەوسێمەوە) و (نەحەسێمەوە) و (هەڵئەسێمەوە) هەر سێکیان بە پیتەکانی (سێمەوە) کۆتا هێنراون، هاوسەروانە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (سەرواداری موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ گولێك شیرینتر له خونچەی بەهار
ناسکتر جوانتر له شەوبۆی نازدار
گەشتر له دیدەی وەنەوشەی نزار
گولێکه ناوی گوڵی سەربەستی
مەردە ئەو گەڵەی بگاتە دەستی... بەختیار زێوەر

وشەکانی (بەهار) و (نازدار) و (نزار) هەرسێکیان به پیتەکانی (ار) کۆتا هێنراون، (ر) پیتی رەوییە، هاوسەروانە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (سەروادری موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ که راپەڕین بۆ ئازادی سکی ئەسووتان
که بازووی ژین کۆتی مەرگی سەرشۆڕیی ئەشکان... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (ئەسووتان) و (ئەشکان) هەردووکیان به پیتەکانی (ان) کۆتا هێنراون، (ن) پیتی رەوییە، (ا) بوونی پێویستەیە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ زۆر درەنگە
ژیان وێنەی شەوەزەنگە... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (درەنگە) و (شەوەزەنگە) هەردووکیان به پیتەکانی (ەنگە) کۆتا هێنراون، (گ) پیتی رەوییە، (ن) و (ە) پێش رەوینە و بوونی پێویستەیە، (ە)ی کۆتایی پاش رەوییە، بەڵام ئەم وشانە هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ هەڵەبجەی شاری جوان و شیرینم
باخی ئاواتم گوڵی ئەوینم... سەعدی ئیبراهیمی

وشەکانی (شیرینم) و (ئەوینم) هەردووکیان به پیتەکانی (ینم) کۆتاهێنراون، (ن) پیتی رەوییە، (م) پێش رەوییە و بوونی پێویستەیە، بەمە هەردوو وشە هاوسەروا دەبن، بەڵام ئەم وشانە هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ کەوی شیعرم کەوتووەتە داو
گڕێك بەربووەتە هەناو... جەلال مەدحەت خۆشناو

وشەکانی (داو) و (هەناو) هەردووکیان بە پیتەکانی (او) کۆتا هێنراون، (و) پیتی ڕەوییە، (ا) پێش ڕەوییە و بوونی پێویستەیە، بەمە هەردوو وشە هاوسەروا دەبن، بەڵام ئەم وشانە هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ کرمی چاوچنۆکی ئێوە بۆتە خۆرەی گیانی میللەت
باکتان نییە گەر بکەونە بەر هێرشی
لۆمەو نەفرەت... خوشکە بێخەو

وشەکانی (میللەت) و (نەفرەت) هەردووکیان بە پیتەکانی (ەت) کۆتاهێنراون، (ت) پیتی ڕەوییە، (ە) پێش ڕەوییە و بوونی پێویستەیە، بەمە هەردوو وشە هاوسەروا دەبن، بەڵام ئەم وشانە هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ هەولێر ئەی شارەکەی جوانم
شانۆی هەزاران داستانم... عەلی فەتاح دزەیی

وشەکانی (جوانم) و (داستانم) هەردووکیان بە پیتەکانی (انم) کۆتا هێنراون، (ن) پیتی ڕەوییە، (ا) پێش ڕەوییە و بوونی پێویستەنە، (م) پاش ڕەوییە، بەمە هەردوو وشە هاوسەروا دەبن، بەڵام ئەم وشانە هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ ئەی شاری سوڵتان موزەففەر
سوڵتانی ئازاو دادپەروەر... عەلی فەتاح دزەیی

وشەکانی (موزەففەر) و (دادپەروەر) هەردووکیان بە پیتەکانی (ەر) کۆتا هێنراون، (ر) پیتی ڕەوییە، (ە) پێش ڕەوییە و بوونی پێویستەیە، بەمە هەردوو وشە هاوسەروا دەبن، بەڵام ئەم وشانە هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ شیعری جوانمان بۆ تۆ دەڵێین
ئەی هەولێری چاکە و بەڵێن... ئیدریس عەبدوڵڵا

وشەکانی (دەڵێین) و (بەڵێن) هەردووکیان (ن)یان پیتی ڕەوییە، هەردوو وشە هاوسەروانە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ دڵە بۆ هەوەس ملم مەشکێنە
ڕێی ڕاستی ژینم لێ مەشێوێنە... عەبدوڵڵا زەنگەنە
وشەکانی (مەشکێنە) و (مەشێوێنە) هەردووکیان (ن)یان پیتی ڕەوییە، هەردوو وشە هاوسەروانە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ چلەی زستانە بۆیە ئاوەکەی زێ ڕەنگی گۆڕاوە
بەشێکی ئاوی بارانە و بەشێکی کەیشی بەفراوە... بەختیار زێوەر
وشەکانی (گۆڕاو) و (بەفرا) هەردووکیان (و)یان پیتی ڕەوییە، هەردوو وشە هاوسەروانە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

ـ تەمەنت ڕابوارد
بە خواپەرستی
ڕوو لە یەزدان و
پشتت لە پەستی... عەبدوڵڵا صالح شاربازێڕی
وشەکانی (خواپەرستی) و (پەستی) هەردووکیان (ت)یان پیتی ڕەوییە، (س) پێش ڕەوی و (ی) پاش ڕەوییە، هەردوو وشە هاوسەروانە، بەڵام هاوکێش نینە، ئەوەش (موتریف)ی پێدەگوترێت.

**سەرواداری متەوازن:**

ئەمە (موازنە) و (مماپلە) و (التسجیع المتوازن)یشی پێدەگوترێت.. جۆرێکە لە سەروادار، لەسەر ئەوە دادەمەزرێ، کە: دوو وشەکانی کۆتایی لەتە دێڕەکان هاوشێوە بن و تەنیا لە پیتی دواییینیان لێك جیابن.. دیارە مەبەست لە هاوشێوەیی، ئەوەیە ئەو وشانە لە رووی مۆسیقییەوە وەکو یەك بکەونە بەرگوێ، بۆیە پێناسەکەی قەزوینی ئەمە روونتر دەکاتەوە، کە دەڵێت: بریتییە لەوەی دوو وشەکانی کۆتایی لەت، هاوکێش بن، بەڵام هاوسەروا نەبن.. ئەمەش ئەوە دەردەخات، کەواتە متەوازن: بریتییە لە یەکسانی دوو وشەکانی کۆتایی لەتەدێڕ بێ ئەوەی لە سەرواشدا یەکسان بن.. بۆ نموونە:
دیارە جوانی متەوازن لە چەند شتێکدایە، لەوانە:

١ـ وەکو هەموو ئەو جۆرانەی دیکەی سەروادار دەبنە هـۆی ئـەوەی خوێندنـەوە ئاسـان و خۆش بێت.

٢ـ ئەمە وا دەکات شێوەی هەندەسی وشەکان رێك و یەکسان بێت.

**چەند نموونەیەکی تر:**

وتم چییە؟
وتی ئەمشەو هاتنە سەرم
لە خەودا بووم دەوریان گرتم
ماڵەکەیان تاڵان کردم... شێرکۆ بێکەس

کۆتایی دێڕی سێیەم بە (گرتم) و کۆتایی دێڕی چوارەم بە (کردم) هاتووە، ئەم دوو وشـەیە هاوکێشن، بەڵام لە سەروادا لێکجیاوازن، سەروای یەکەمیان (ت) و سەروای دووەمیـان (د)ە، (م) کە لە دوای هەردووکیان هاتووە، پاش سەروایە، ئـەوەش (متـەوازن)ە، چـونکە وشـەکان هاوکێشن، بەڵام هاوسەروا نین.

ـ بە هۆنراوەی رەنگاورەنگی
دەروون و هەستم
پرچی بووکی ئاهەنگەکەی
ئێستات ئەبەستم
بە هاواری
تۆقێنەری کاوەی ناو دەنگم
لەگەڵ ماری ئەژدەهاکی ژینتا
ئەجەنگم... شێرکۆ بێکەس

کۆتایی دێڕی چوارەم، کە کۆتایی کۆپلەی یەکەمە بە (ئەبەستم) و کۆتایی دێڕی چوارەم لە کۆپلـەی دووەم بـە (ئەجـەنگم) هـاتووە، ئـەم دوو وشـەیە هاوکێشـن، بـەڵام لـە سـەروادا لێکجیاوازن، سەروای یەکەمیان (ت) و سەروای دووەمیان (گـ)ە، (م) کە لە دوای هەردووکیان هاتووە، پاش سەروایە، ئەوەش (متەوازن)ە، چونکە وشەکان هاوکێشن، بەڵام هاوسەروا نین.

**سەرواداری متەوازی:**

لە (التسجيع المتوازي)ی عەرەبی وەرگیراوە.. جۆرێکە لە سەروادار، ئەوەیە، کە: وشە کۆتاییەکانی رستە، یان لەتەدێڕ هاوکێش و هاوسەروا بن.. واتا متەوازی ئەوەیە: وشە کۆتاییەکانی رستە، یان لەتەدێڕ پیتەکانیان بە قەد یەکبن، یا زۆربەشیان، یان هەندێکیشیان لێك جیاواز بن، بەڵام لەسەر یەك کێش بن و یەك سەرواشیان هەبێ.. بۆ نموونە:

ـ سەد شوکری خودا پاکە دەروونم لە عەداوەت
وەك بەعزە کەسێ نیمە دڵی پڕ لە قەساوەت... بەختیار زێوەر

وشەکانی (عەداوەت) و (قەساوەت) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ یان چۆن ئەو نەختە مێشکە
بۆ فەن بووە بە بێشکە... گۆران

وشەکانی (مێشکە) و (بێشکە) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ یان کام دەریا زۆر قووڵە
بنی بخەمە جووڵە... گۆران

وشەکانی (قووڵە) و (جووڵە) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ نە دەس و نە دڵ نە تام نە بۆ نە رەنگ نە هەواڵ
نە دەنگ و سەنگ نە ناونیشان نە خەو نە خەیاڵ... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (هەواڵ) و (خەیاڵ)، کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ میر وتی: ئەو راوو رێوییە
کەڵکی نییە
ناوت زڕاندووم
ئابڕووت بردووم
خوێڕییەکی تڕۆی
پێویستە بڕۆی... محەمەد حسێن بەرزنجی

وشەکانی (تڕۆ) و (بڕۆ) لەسەر یەك کێش و یەك سەروان، ئەوەش سەرواداری متەوازی دروستکردووە.

ـ شارە جوانەکەم هەڵەبجەی مەزڵوم
بێ تاوانەکەی بە ناهەق مەحکوم... فەرەیدون بەهرامی

وشەکانی (مەزڵوم) و (مەحکوم) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ چوار وەرزیساڵ من راوکەرم
شاخەوانم
ڕێگای چیام لێگیراوە
باخەوانم... جەلال مەدحەت خۆشناو

وشەکانی (شاخەوانم) و (باخەوانم) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو برگەکانی یەکەم و دووەمی ئەم کۆپلەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ ئەزانی مەلی نوکتەو گفتوگۆ		کۆچی کردووە
دەزگاو دوکانی ئەدەب ئەڵێ ڕۆ		بێخود مردووە... **محەمەد صالح دیلان**

وشەکانی (کردووە) و (مردووە) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ بنووسین بۆ حەسەنمان
بۆ لەناوچووی وەتەنمان... **محەمەد صالح دیلان**

وشەکانی (حەسەنمان) و (وەتەنمان) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

ـ تۆش بەسییە ئیتر دوودڵی و ترس و بەهانە
ئەمجارە لەناوچوون و بە ملیۆنە نەمانە... **محەمەد صالح دیلان**

وشەکانی (بەهانە) و (نەمانە) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

# بەشی دووەم

# جوانکاری واتایی

**دژیەك:**

یەکێکە لە هونەرەکانی جوانکاری واتایی، لای عەرەبکان بە زاراوەکانی (الطباق والمطابقة، والتطبيق والتضاد والتكافوء) ناودەبرێت، بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو وشە، کە ئەو وشانە لە رووی واتاوە دژ و پێچەوانەی یەك بن، بۆ نموونە: رەش و سپی، پاك و پیس، جوان و ناشـرین، گەورەو گچکە، پاك و ناپاك...هتد. بۆ نموونە:

ـ ئاخر بەهاری نەوجەوانیمە

ئەوەل پایزی زیندەگانیمە... پیرەمێرد

(ئەووەل) و (ئاخر) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکترین، هەر یەکەو رەگێکی سـەربەخۆیان هەیە، بۆیە (دژیەکی فەرهەنگی)نە.

ـ ئەگەرچی رۆژهەڵاتین و کەساسین

لە رۆژئاوایی زیاتر دووڕشوناسین... بەختیار زێوەر

(رۆژهەڵاتی) و (رۆژئاوایی) دوو وشەی دژ و پێچەوانەی یـەکترین، هـەر یەکـەو رەگێکـی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە (دژیەکی فەرهەنگی)نە.

**جۆرەکانی دژیەك:**

یەکەم: بە پێی پێکهاتەی وشەیی وشە دژیەکەکان دژیەك دوو جۆری سەرەکی هەیە، ئەوانیش بریتینە لە:

**١ـ دژیەکی فەرهەنگی (طباق الأيجاب)**

ئەو دژیەکەکەیە کە دوو وشەکان لە فەرهەنگی زمانەوە هەر یەکەو رەگێکی سەربەخۆیان هەبێت.. بۆ نموونە:

ـ کوڕو کچی ئەم شارە چەندە جوانن

بەم جەژنە وا دڵخۆش و کامەرانن... دانا عەبدولجەبار

(کوڕ و کچ) لە نیوە دێڕی یەکەمدا دوو ناوی بەرجەستەن و (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

ـ گوایە گەلێکم خۆشئەوێی

بڕوا بکە خۆشم ناوێی

هەرگیز رقیشم لێت نابتەوە

نازانم چیت ناوبنێم چی؟!

نە (رق)ی نە (خۆشەویستی) ... رێدار سابیر

(رق) و (خۆشەویستی) دوو وشەی فەرهەنگی دژو پێچەوانەی یەکترین.

**جۆرەکانی دژیەکی فەرهەنگی:**

**یەك: دژیەکی لە دوو ناوی واتایی**

ـ گرێی دەست بۆ دان مەهێڵەرەوە

شەڕ بەشی ئاشتیی تیا بێڵەرەوە... پیرەمێرد

(شەڕ) و (ئاشتی) دوو ناوی واتایی دژو پێچەوانەی یەکترین، دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو رەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

ـ بستێك نەمام بووی تاکو بوویتەدار

لە سارد و گەرمی بۆت بووینە دیوار... مەدحەت بێخەو

(ساردی) و (گەرمی) دوو وشەی (دژیەك)ن، هەر لە بنجدا ریشەی وشەكانیان لە دوو سەرچاوەی لێكجیا هاتوون، دوو (ناوی واتایی)نە.

**دوو: دژیەك لە دوو رستەی فرمان رابردوو (تێنەپەڕ ـ داڕژاو)**

ـ چەند روانی شێر دیار نەبوو

بێ پەروا دەهات و دەچوو... مەدحەت بێخەو

(دەهات) و (دەچوو) دوو رستەی هەوالّی (راگەیاندن)ن، فرمانەكانیان تێنەپەڕە، دوو رستەی فرمان رابردوون.

**سێ: دژیەك لە دوو رستەی فرمان رابردوو (تێپەڕ ـ سادە)**

ـ هەمان رۆژی رێی شاری بڕی

داری فرۆشت، دونگی كڕی... مەدحەت بێخەو

(فرۆشت) و (كڕی) دوو رستەی هەوالّی (راگەیاندن)ن، فرمانەكانیان تێپەڕە، رابردوون.

**چوار: دژیەك لە دوو رستەی فرمان رانەبردوو**

ـ هەر بەو پێو دانگە كە بۆت داناوە

وا دێت و دەچێ هیچ نەسوواوە... پیرەمێرد

(دێت) و (دەچێ) دوو رستەی فرمان رانەبردوون، لە واتادا دژو پێچەوانەی یەكن، هەریەكەشیان رەگێكی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە ناویان دەنێین دژیەكی فەرهەنگی.

ـ بۆ دارستانی شێر بــــــــچی

یان تێدەچی، یان دەردەچی... مەدحەت بێخەو

(تێدەچی) و (دەردەچی) دوو رستەی فرمان رانەبردوونە،

**پێنج: دژیەكی دوو ئاوەڵناو**

ـ بە سروە دڵم فێنك كاتەوە

خەمی کۆن و نوێم لە بیر باتەوە... شێخ نووری
(کۆن و نویَ) لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو ئاوەڵناوی چۆنین، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

**شەش: دژیەکی دوو ئاوەڵفرمان**

ـ لە راست تەختی سلێمانی چوار پێنج ئەوەندەی مانگ
گلۆپی نور دەر و ژوور رووناك ئەکاتەوە تا بانگ... پیرەمێرد

(دەر) و (ژوور) دوو ئاوەڵفرمانن دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو رەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

ـ من خوار و ژوور لە دەست چووەکەی بێوڵەت خۆم، ئەوان
وەك خێڵیَ خوار و ژوورکەری کورد! وێڵی ئاسمان... پیرەمێرد

(خوار) و (ژوور) دوو ئاوەڵفرمانن دژیەکی فەرهەنگینە، چونکە هەر یەکەو رەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

**٢ـ دژیەکی نافەرهەنگی (طباق السلب):**

ئەو دژیەکەیە، کە دوو وشەکانی یەکیان نەفی ئەوی تریانە، واتە هەردووکیان لە فەرهەنگدا یەك رەگیان هەیە، نەك دوو رەگی سەربەخۆ.. بۆ نموونە:

ـ بەند نەبووم بەند گوشاد بووم
قەهرەمانی دیوزاد بووم.... پیرەمێرد

(نەبووم) لەگەڵ (بووم) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکن، هەردووکیان لە فەرهەنگدا یەك ریشەیان هەیە، (نەبووم) نەفیی (بووم)ەو لەسەر بنەمای نەفیکردنی ئەو دروستبووە.

لەم نموونەیەی سەروو تەنها وشە نەفیکراوەکە پێشگری نەفیی خراوەتەسەر، بەڵام جاری وەها هەیە، چ وشەی یەکەم و چ وشەی دووەمیش، واتە: وشە (ئەریَ)کەش هەر پێشگر، یان پاشگر وەردەگرێت، بۆ نموونە:

ـ ژین بڕانەوەی بۆ نییە
باسی من من و تۆ نییە

تۆش و زەویش و بەهاریش
بە گیان، بێ گیان، بەرو داریش
ئەستێرە، ئاسمان، مانگ و خۆر
دەبن، دەچن، بە هەل، بە نۆر... د. عەلی شەریعەتی (و: هەژار)

(بە گیان) و (بێ گیان) دوو دەستەواژەن، یەك رەگیان هەیە، کەوا (گیان)ە، یەکەمیان بە پێشگری (ئە)، کە هێمای (ئەرێ)یەو دووەمیان بە پێشگری (بێ)، کە هێمای (نەرێ)یە، کراونەتە دژ و پێچەوانەی یەکتری، بەوەش (دژیەکی نافەرهەنگی)یان بەرهەم هێناوە.

**جۆرەکانی دژیەکی نافەرهەنگی:**

**یەك: دژیەکی فرمانی**

ـ منداڵەکان هەبـــــــــوو نەبوو
لە ناو کێوێك شێرێك هەبوو... بێخەو

(هەبوو) و (نەبوو) دوو وشەی (دژیەکی نافەرهەنگی)ن، چونکە دووەمیان (نەرێ)ی یەکەمیانە، فرمانی ناتەواوی داڕژاون.

ـ رۆژانێ بوو
خەفەت شوێنی حەسانەوەی
لامان نەبوو... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (بوو) و (نەبوو) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکن، دووەم نەرێی یەکەمە و بەوە دژیەکی نافەرهەنگی دروستبووە.

ـ پێ بزانم یان نەزانم
کە پارچە کاغەزێکی پیی ئەدڕێنم
وشەیەکی هێشتا نەزاوی ناو سەری
قەڵەمەکەم.. ئەگرییێنم... شێرکۆ بێکەس

وشەکانی (بزانم) و (نەزانم) دوو وشەن، فرمانن، دژو پێچەوانەی یەکن، دووەم نەرێی یەکەمەو بەوە دژیەکی نافەرهەنگی دروستبووە.

ـ هەرکوێیەکت بەدی ئەکەم، ئەڵێم: ئۆخەی
هەر کوێیەکت بەدی ناکەم، ئەڵێم: خۆزگە
من بە خۆزگەو ئۆخەی ئەژیم... حەسیب قەرەداغی

وشەکانی (ئەکەم) و (ناکەم) دوو فرمانی رانەبردوون، دووەمیان نەرێی یەکەمیانە، بەوەش (دژیەکی نافەرهەنگی) دروست بووە.

**دوو: دژیەکی چاوگی**

ـ بوون و نەبوونم لەلا یەکسانە
لە وەختی غەمدا شادیم ئاسان کە... پیرەمێرد

(بوون) چاوگێکە ئەرێیە، (نەبوون) نەرێی ئەوە، لەسەر بنەمای ئەو دروستبووە، بۆیە هەردووکیان یەك رەگیان هەیە، نەك دوو رەگی سەربەخۆ، بەڵام دژ و پێچەوانەی یەکن، بەو جۆرە دژیەکەش دەڵێین: دژیەکی نافەرهەنگی.

**سێ: دژیەکی ئاوەڵناوی بکەر**

ـ زێڕینە پەندی باپیران
وانەیە بۆ زانا و نەزان... بێخەو

(زانا) و (نەزان) دوو ئاوەڵناوی بکەرن، یەکەمیان (سادە) و دووەمیان (داڕژاو)ە، دوو وشەی (دژیەکی نافەرهەنگی)ن، چونکە دووەمیان (نەرێ)ی یەکەمیانە.

**چوار: دژیەکی زاراوەیی**

ـ بارانبڕەیەك هێلکەی خۆی دا بە دوو تفەنگچی
بۆ نیشان شکاندن بەکاری بێنن
دوو گیانەوەریش
نۆبەرە
ئاسمانی
دوابەرە... سەباح رەنجدەر

(نۆبەرە) و (دوابەرە) دوو زاراوەن دژیەکی نافەرهەنگی دروست دەکەن.

**چەند جۆرێکی دیکەی دژیەك:**

**١ـ دژیەکی تاك حاڵەت**

ئەوەیە لە دێڕە شیعرێکدا یەك جووتە وشەی دژو پێچەوانەی یەکتری بە جودا هاتبن، بۆ نموونە:

ـ گیپەو کەشکەك بە رۆنی لەش

دەسدار ئەیباو بێدەس بێبەش... پیرەمێرد

(دەسدار) و (بێدەس) دوو ئاوەڵناوی بکەرن، بناغەی هەردووکیان هەر وشەی (دەس)ی کورتکراوەی (دەست)ە، یەکەمیان بە هۆی پاشگری (دار) و دووەمیان بە هۆی پێشگری (بێ)وە کراونەتە دژ و پێچەوانەی یەکتر، بۆیە دژیەکی نافەرهەنگییان پێکهێناوە.

**٢ـ دژیەکی فرە حاڵەت**

ئەو دژیەکەیە لە دێڕە شیعرێکدا زیاتر لە چەند حاڵەتێکی بەدوای یەکتریدا دێن.. بۆ نموونە:

ـ رۆژتان ئەکەین بە شەوە زەنگ

ئاشتیتان لێ ئەکەین بە جـــــەنگ... بێخەو

لە نیوەدێڕی یەکەمدا (رۆژ) و (شەوەزەنگ) دوو (ناو)ن، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.. لە نیوە دێڕی دووەمیش (ئاشتی) و (جەنگ) دیسانەوە دوو (ناو)ن، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

ـ شایی بکەن

دەیکەین بە شین

پرسە دانێن

کاستان دەکەین بە پێکەنین... پەشێو

شایی و شین لە دوو دێڕی یەکەم و پرسە و پێکەنین لە دوو دێڕەکانی تر، دوو دژیەکییان دروست کردووە، ئەم دێڕەش بەم شێوەیە زیاتر لە حاڵەتێکی دژیەکی تێدا بەرجەستەبووە.

### ٣ـ دژیەكی تێكەڵ

ئەو دژەیەكەیە كە دوو وشەكانی روون و سەربەخۆن، بەڵام لـە فەرهەنگـدا چ دژیـەكی و پێچەوانەییەكیان نییە.. بۆ نموونە:

ـ ئاشتی تەمی بنارگرتووی ئاخ و تاسەی

ڕەنجدەرانی كوردستان و هەندەرانە

ئاشتی گوڵی ئاڵی هێرۆی شەپۆڵێكە

وا بە قژی سپی و خاوی رووباری ئەبەدیەتەوەو

گۆرانی پاكی سەرزاری دڵدارانە... ئەنوەر قادر محەمەد

(كوردستان) و (هەندەران) دژیەكی دوورن، چوون لە هەنگاوی دووەمدا كوردسـتان واتـە (ناوەوە)و هەندەران، واتـە (دەرەوە)، دیـارە نـاوەوە و دەرەوەش دوو وشـەن دژ و پێچـەوانەی یەكن.

### ٤ـ دژیەكی وەهمی

بریتییە لە بوونی دو وشە، كە لە رواڵەتدا دژ و پێچەوانەی یەكترینە، بەڵام لە راسـتیدا چ پەیوەندییەك لە نێوانیاندا نییە، هێندە هەیە شێوەیان لەیەك دەچێت.. بۆ نموونە:

ـ بە خەم خواردنیش هیچ درووست نابێ

شكاتی ناپاك لەلای خودا بێ... عەتا فەتاحی

لەم دێڕەدا وا دەكەوێتە بەرچاو (نابێ) دژیەكی نافەرهەنگی (بێ) بێ، بەڵام لێرەدا وشەكان بەم شێوەیە نەهاتوون، (بێ)یەكە، (دەبێ) نەهاتووە، تا دژیەكی (نابێ) بێ، بەڵكو بـە واتـای لەوێبوون هاتووە، بەوەش چ دژیەكییەك دروست نەبووە، ئەگەرچیش پێكبچن، بۆیە پێی دەڵێین دژیەكی وەهمی.

### بەرامبەری:

یەكێكی دیكەیە لە هونەرە گرنگەكانی جوانكاری وشەیی، لەسەر بنەمای دژیەكی نێوان چەند وشەیەكی بەرامبەر بەیەك هاتوو دادەمەزرێت، بەڵام لە (دژیـەك) بـەهێزتر و جـوانترەو دەسەڵاتێكی گەورەتری خاوەنەكەی پیشان دەدات.. لە عەرەبیدا (المقابلە)ی پێدەڵێن.

بەرامبەری شێوازێکی دەربڕینە لەسەر پرەنسیپی دروستکردنی دژیەکی لە وشە و واتاو بیر و وێنە بۆ ئامانجانێکی رەوانبێژی و بەهایانێکی فیکری بەرهەمدێنرێت، بە یەك لە شێوازە دیارەکان دەژمێردرێت، کە بە مەبەست پەنای بۆ دەبرێت. ئەگەرچیش زۆربەی بەلاغییە کۆنەکان بە یەکێك لە جوانکارییەکانی شیعریان هەژماردووە، بەلاّم ئەوەی لە گوزارشت و بەکارهێنانە زۆرەکانی رابمێنیّ، بۆی دەردەکەوێت، کە ئەمە هونەرێکی رەوانبێژییە، رێگەیێکە بۆ گەیاندنی واتا، کاریگەری و بەهای قووڵی هەیە، هەروەها ئەمە بەشداری دەکات لە زەقکردنەوەی واتایانێکی زۆر، لە نێویاندا دووانەیی و دژیەکی.

پێدەچیّ ئیبن و رەشیقی قەیرەوانی یەکەم کەس بوو بیّ، کە هاتبیّ جیاوازی لە نێوان دژیەك و بەرامبەری کردبیّ، ئەو لە کتێبەکەیدا دێت دەنووسێت: بەرامبەری ئەوەیە گوتە بەو شێوەیەی پێویستە ریزبەند بکرێت، ئیتر ئەوە بدرێتە سەرەتای گوتە، کە شیاوە لە سەرەتا بێت و ئەوە بدرێتە بەشی دوایی گوتە، کە شیاوە لە بەشی دوایی بێت، بە مەرجێك بۆ هەر شتە شتێکی هاوپەیوەندیی بیّ لە بەشی دووەمی گوتەکە، کە ئەو پەیوەندییە دژیەکییە.

بە کورتی بەرامبەری: بریتییە لە بوونی بە لانی کەم چوار وشە، دوویان لە بەشی یەکەمی ئاخاوتن و دووەکانی تر لە بەشی دوای ئەوەوە بێن، بەو مەرجەی پەیوەندی نێوان هەر وشەیەکی بەشی یەکەم و وشە بەرامبەرەکەی لە بەشی دووەمدا پەیوەندییەکی دژیەکی بێت.. بۆ نموونە:

ـ (قل اعوذ) تۆ بێژە

شەو کورتە و رۆژ درێژە... پیرەمێرد

لێرەش لە نیوە دێڕی دووەمدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشەی (شەو) و (کورت) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، کە بریتینە لە (رۆژ) و (درێژ).. (رۆژ) لە بەرامبەر (شەو) و (درێژ) لە بەرامبەر (کورت) وەستاون، کە پەیوەندی نێوان ئەم وشانە لەگەڵ یەکتری (دژیەکی)یە، بۆیە بەمەش (بەرامبەری)یەکی تر دروستبووە.

ـ کردەی تۆ و بردەی نادی مەزڵوم بیّ

خراپەت دیاربیّ و چاکەت بن گۆم بیّ... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی دووەمدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشەی (خراپە) و (دیار) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، کە بریتینە لە (چاکە) و (بن گۆم).. (چاکە) لە

بەرامبەر (خراپە) کە پەیوەندی نێوانیان دژیەکییە، (بن گۆم)یش لە بەرامبەر (دیار) کە پەیوەندی نێوان ئەوانیش دژیەکییە، بۆیە بەمە (بەرامبەری دوویی) دروستبووە.

ـ ئاهەنگ ئەگێڕین دەستی یەك ئەگرین
تاڵی ئەفرۆشین، شیرینی ئەکڕین... بێخەو

لە نیوە دێڕی دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، (تاڵی ئەفرۆشین، شیرنی ئەکڕین)، (تاڵی) و (شیرینی) دوو (ناوی واتایی)نە (دژیەکی فەرهەنگی)نە، (ئەفرۆشین) و (ئەکڕین)یش دوو رستەی راگەیاندنن، (دژیەکی فەرهەنگی)نە.. دەبینین لە بەرامبەر وشەی (تاڵی) رستەی یەکەمی نیوە دێڕی دووەم، وشەی (شیرینی) لە رستەی دووەمی هەمان نیوە دێڕدا هاتووە.. لە بەرامبەر رستەی (ئەفرۆشین)یش لە رستەی یەکەمی نیوە دێڕی دووەم، رستەی (ئەکڕین) لە رستەی دووەمی هەمان نیوە دێڕدا هاتووە.. واتە وشەکانی رستەی یەکەم و دووەمی نیوە دێڕی یەکەم دژ و پێچەوانەو بەرامبەری یەك هاتوونە، بەوەش (بەرامبەری) دروست بووە.

**بەرامبەری دوویی و بەرامبەری سێیی:**

**بەرامبەری دوویی:**

لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەر دوو گروپە بەرامبەرەکان دوونە، هەر وشەیەکەیان لە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە رێکی بێت، یان بە ناڕێکی.. بۆ نموونە:

ـ لە زەویی ئەمشەوەوە
تا ئاسمانی سبەینێ
ڕێگەییێکی دوور و درێژەو
گشت پردەکانی رووخاون... فەرهاد شاکەلی

لە بەرامبەر (زەوی ئەمشەو)دا (ئاسمانی سبەینێ) هاتووە، (ئاسمان) لە بەرامبەر (زەوی) و (سبەینێ) لە بەرامبەر (ئەمشەو)، بەوەش بەرامبەری دوویی دروستبووە.

**بەرامبەری سێیی:**

لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان سێ وشەن، هەریەکەیان لە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە ڕێکی بێت، یان بە ناڕێکی.. بۆ نموونە:

ـ ڕۆژی رووناکی ئاشتی گیراوە

بۆ شەوی تاری شەڕێ گۆڕاوە... باوکی ئازیز

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، وشەکانی (ڕۆژ) و (رووناك) و (ئاشتی) هاتوون، لە نیوە دێڕی دووەمیشدا، وەك بەرامبەرییەکی ئەم وشانە، سێ وشەی (شەو) و (تار) و (شەڕ) هاتوون.. پەیوەندی نێوان (شەو) و (ڕۆژ) پەیوەندییەکی دژەواتایە.. پەیوەندی نێوان (تار) و (رووناك) و پەیوەندی نێوان (شەڕ) و (ئاشتی)ش دیسانەوە پەیوەندی دژەواتاییە. بەم شێوەیەش (بەرامبەرییەکی سێ بە سێ)ییمان بۆ دروستبووە.

**بەرامبەری ڕێك و بەرامبەری ناڕێك:**

**١ـ بەرامبەری ڕێك**

ئەوەیە وشەکانی بەشی دووەمی بە ڕێکی لە بەرانبەر وشەکانی بەشی یەکەمیدا دێن.. بۆ نموونە:

ـ وەك هەوری بەهار بۆ خۆی بگری زار

ڕۆژی رووناکی بێتە شەوی تار... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی دووەمدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشەی (ڕۆژ) و (رووناك) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر بە ڕێکی بەرامبەر ئەوانە هاتوونە، کە بریتینە لە (شەو) و (تار).. (شەو) لە بەرامبەر (ڕۆژ) و (تار) لە بەرامبەر (رووناك) وەستاون، کە پەیوەندی نێوان ئەم وشانە لەگەڵ یەکتری (دژیەکی)یە، بۆیە بەمە (بەرامبەری ڕێك) دروستبووە.

**٢ـ بەرامبەری ناڕێك**

ئەوەیە وشەکانی بەشی دووەمی بە ناڕێکی لە بەرانبەر وشەکانی بەشی یەکەمیدا دێن.. بۆ نموونە:

وەرە ئەی گوڵ

دڕك ڕۆیی

ژیان هەر بە تۆ جوانە... ئیدریس

سەرەتا لەم کۆپلەیەدا (وەرە گوڵ) هاتووە، دوابەدوای ئەو و لە بەرامبەریدا (دڕك ڕۆیی) هاتووە، دەبینین بە نارێکی (دڕك) لە بەرامبەر (گوڵ) و (ڕۆیی) لە بەرامبەر (وەرە)، پەیوەندی نێوان ئەم جووتە وشانە دژیەکییە، بەوەش بەرامبەری نارێك دروستبووە.

## بەرامبەری فرە حاڵەت:

ئەو بەرامبەرییەیە، کە لە کۆپلەیەکدا زیاتر لە حاڵەتێکی بەرامبەری لە دوای یەك دێن، دەشێ دوو بن، یان سێ، یان زیاتر... بۆ نموونە:

ـ بمانبوورن منالآنی پاکی ئەمڕۆ و

براکوژانی سبەینێ

ماچی ئەمڕۆ و تفی سبەی... مارف ئاغایی

لە بەشی یەکەمی ئەم کۆپلەیە، لە بەرامبەر (پاکی ئەمڕۆ) (براکوژانی سبەینێ) هاتووە، (براکوژ) لە بەرامبەر (پاکی) و (سبەینێ) لە بەرامبەر (ئەمڕۆ)، لە بەشی دووەمیشدا لە بەرامبەر (ماچی ئەمڕۆ)دا (تفی سبەی) هاتووە، (تف) لە بەرامبەر (ماچ) و (سبەی) لە بەرامبەر (ئەمڕۆ)، پەیوەندی نێوان هەموو ئەو وشە بەرامبەر یەکهاتووانە پەیوەندی دژیەکییە، بەوەش دوو بەرامبەری بەدواییەکدا هاتوونە.

## جیاوازی نێوان (دژیەك) و (بەرامبەری):

دەشێت گرنگترین جیاوازی نێوان (دژیەك) و (بەرامبەری) لەوەدا کورت بکرێتەوە، کەوا:

(دژیەك) لەو دێڕ و رستانەدا بەرجەستە دەبێت، کە تیایاندا بە تەنیا دوو وشەی دژبەیەك دێن.. بەڵام (بەرامبەری) لەو دێڕ و رستانەدا بەرجەستە دەبێت، کە بەلانی کەم تیایاندا وشە دژیەکەکان لە چوار وشە کەمتر نەبن، جا ئەگەر زیاتریش بن ئاساییە، بەڵام بەو مەرجەی لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشە، یان سێ وشەو زیاتر بێت، لە (بەرامبەری) شیاندا لە بەشی دووەمی گوتەکە بە قەد ژمارەی ئەوانەی پێشوو وشەی تر هاتبن، نەك بەو شێوەی کە هەر

جارەی وشەیەك هاتبیٚ و یەكسەر دژیەكەكەی بەدوایدا هاتبیٚ، چونكە بەو شێوەیە ئەگەر دێڕێك زیاتریش لە چوار وشەی دژیەكی تیاهاتبێت هەر (دژیەك)ە و (بەرامبەری)ی دروست نەكردووە.. بۆ وێنە:

- رۆژ و شەو نین

نوور و تاریكی نەتوانن پێك هەڵبكەن... مارف ئاغایی

ئەوەتا لەم كۆپلەیەدا، لە دێڕی سێیەمدا وشەكانی (رۆژ) و (شەو) بەدوای یەكدا هاتوون و (دژیەك)یان دروستكردووە، لە دێڕی چوارمیشدا وشەكانی (نوور) و (رووناكی) هاتوون و (دژیەك)یان دروستكردووە، ئەم جۆرە دێڕانەش بە نموونەی (دژیەك) دەناسرێن، چونكە وەك گوتمان دوو وشە دوو وشە نەهاتوون، بەڵكو هەرجارەی وشەیەك هاتووە، یەكسەر دژەكەشی بەدوایدا هاتووە. بەوەش (بەرامبەری) دروست نەبووە، بەڵام ئەگەر سەیری ئەم دێڕەی خوارەوە بكەین:

- بەهەشتیٚ بوو سەراسەر نیشتمانم

ئەوێستا دۆزەخێكی سەرزەمینە...دڵزار

لە نیوە دێڕی یەكەم (بوو) فرمانی ناتەواوە، گوزارەكەی هەستییە واتە؛ (ئەوسا)، كە ئەمە لەبەر رێكی دەربڕین و كێشی هۆنراوەكە لابراوە، بەڵام لە هەستدا ماوە، كەواشبێت لە نیوە دێڕی یەكەم وشەكانی (ئەوسا) و (بەهەشت) هاتوون، لە نیوە دێڕی دووەمیش بە دوای ئەوان وشەكانی (ئەوێستا) و (دۆزەخ) هاتوون، (ئەوێستا) بەرانبەر (ئەوسا) كە پەیوەندی نێوانیان (دژیەكی)یە، (دۆزەخ)یش بەرانبەر بە (بەهەشت)، كە پەیوەندی نێوان ئەوانیش (دژیەكی)یە، بەوەش (بەرانبەری) دروست بووە. ئەوەش بەرانبەرییەكی لە راستیدا جوانە، چونكە دوو وشەكانی بەشی یەكەمی گوتە، یەكیان بە ئاشكراو ئەوی تریان بە پۆشراوی هاتووە، لە واتای دێڕەكە خوێنەر هەستی پیٚ دەكات، بەڵام بە ئاشكرا لەناو دێڕەكەدا نەهاتووە.

### چاولەیەك:

(چاولەیەك) لە عەرەبیدا (**مراعاة النظیر**)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بەیەكەوەهێنانی دوو شت یان زیاتر، كە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی بەیەكەوە گونجانی و هاوچەشنییە.. بۆ نموونە:

ـ شوێنی هەزاران داستانـــــــــــی هۆزی
سەرچاوەی شیعر و لاوك و حەیرانی... بێخەو

لە نیوە دێڕی دووەمی ئەم دێڕەدا سێ وشەکانی (شـیعر و لاوك و حـەیران) کـە بـە دوای یەکدا هاتوون، (چاولەیەك)ییان دروستکردووە، چونکە هەرسێکیان لە هونەرە قسـەییەکانن و پەیوەندی نێوانیان لە ڕووی دەربڕینەوە پەیوەندییەکی هاوچەشنییە، کە هـەموویان لـە وشـەو ڕستە پێکدێن.

ـ ئەترسم
ئەم کرمی
هیجرەت و فیرقەت و غوربەتە
بتکوژێ... ڕێدار سابیر

هیجرەت و فیرقەت و غوربەت سێ حاڵەتی نائاسایی بەدواییەکەوە هاتوون، (چاولەیەك)ن.

ـ باست بۆ گیان و هۆش و دڵ
ئاو و هەواو گلە بۆ گوڵ... جەمال بێدار

ئاو و هەواو گل.. سێ توخمی ژینگەیینە، هەمیشە پێکەوە دێن. (چاولەیەك)ە.

## گرنگی چاولەیەك:

چاولەیەك گرنگییەکەی لەوەدایە، ڕێگە نادات خوێنەر لە واتادا بە هەڵە بچێ، چونکە ئەو وشانەی هاوشێوەنە و پێکەوە دێن، دەبێ بۆ واتای دروست هاتبن، نەك یەك بە واتای دروست و ئەوی تر بە واتای خوازەیی، بەوەش واتا بە ڕاستی دەمێنێتەوەو خوێنەر لێی تێك ناچێ.

## پێچە و پەخشە:

لە عەرەبیدا (اللف والنشر)ی پێدەگوترێت.. ئەوەیە چەند وشەیەك بە دوای یـەك بێنـی و پاشان بە قەد ئەوانەوە وشەی تر بێنی، کە پەیوەندییان بە وانەی پێشەوە هـەبێ، بـێ ئـەوەی دیاری بکەی کام وشە بۆ کام وشە دەگەڕێتەوە، چونکە خوێنەر دەتوانێ هەر وشەیەك بۆ ئـەوە بباتەوە، کە پەیوەندی پێوە هەیە.. دیارە لێرە مەرج ئەوەیە ژمارەی وشەکانی بەشی یەکەمی

گوتەکەو ژمارەی وشەکانی بەشی دووەمی گوتەکە بە قەد یەك بن و پەیوەندی نێوانیشیان دەشێت بەیەکەوە گونجان و بۆیەك شیان و پەیوەستی و دژیەکی یان هەر پەیوەندییەکی تر بێت، بەلام پەیوەندی نێوان هەموویان دژیەکی نەبێت، چونکە لەو بارەدا دەبێتە (بەرامبەری).. بۆ نموونە:

ـ سەرو زوبانم بە فیکر و سەبات

هەروا بێڵەوە هەتا دێمە لات... پیرەمێرد

شاعیر لێرەدا لە بەشی یەکەمی گوتەکەی وشەکانی (سەر) و (زوبان)ی هێناوە، پاشتر بە شوێن ئەواندا دوو وشەی (فیکر) و (سەبات)ی هێناوەتەوە، کە ئاشکرایە (فیکر) بۆ (سەر) دەگەڕێتەوەو لەگەڵ ئەو پەیوەندی پەیوەستی بە یەکیان هەیە. (سەبات)یش بۆ (زوبان) دەگەڕێتەوە، کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندییەکی بە یەکەوە هاتوویە، هەموو (زوبان)ێك دەشێت (سەبات)ی ببێ و دەشێت نەیبێت. بەمەش پێچەو پەخش دروستبووە.

ـ بەرچاو و پێلاو هەردووکیان تەنگ بێ

ئەبێ پێی دڵ و پێی ڕۆیین لەنگ بێ... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەمدا شاعیر دوو وشەی (بەرچاو) و (پێلاو)ی هێناوە، لە پاش ئەواندا دەستەواژەکانی (پێی دڵ) و (پێی ڕۆیین)ی هێناوەتەوە، کە بە ریزە بۆ ئەو وشانەی پێشوو دەگەڕێنەوە، پەیوەندی نێوان (پێی دڵ) و (بەرچاو) پەیوەندییەکی پەیوەستی و پەیوەندی نێوان (ڕۆیین) و (پێلاو) دیسانەوە پەیوەندییەکی پەیوەستییە، بەوەش دیسانەوە نموونەیەکی تری پێچە و پەخشە دروستبووە.

ـ تەمەنی تۆ، باوکێتی تۆ

وەکو بەفر و ئەو کەژانە سپی و بەرزن

موویەکی سپی سپی بووم

کە گەرمای ئەم دنیا دوونە

دەهات بە سینەو بە ڕوومدا... ئەنوەر قادر محەمەد

لەم پارچەیەدا بەفر و کەژ هاتووە دواتر سپی و بەرز هاتووە، سپی لە بەرامبەر بەفرەکـەو بەرز لە بەرامبەر کەژەکە، پەیوەندی نێوانیشیان پەیوەندی راستەقینەی ئەو شت و سیفەتانەیە پێکەوە، بەوەش پێچە و پەخشە دروست بووە.

## جۆرەکانی پێچە و پەخشە:

یەکەم: بەگوێرەی ژمارەی ئەو وشانەی (پێچە و پەخشە) کە دروست دەکەن، ئەم جۆرانەی (پێچە و پەخشە) هەن:

### ١ـ پێچە و پەخشەی دوویی:

لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان دوونە، هەر وشەیەکەیان لە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە رێکی بێت، یان بە نارێکی، پەیوەندی نێوانیشیان دەشێ هەر پەیوەندییەك بێت.. بۆ نموونە:

ـ هات گۆتە من
تو مەزنی و دڵ بچیکی
وەسا نەبە.. باش فێرببە... سعاد سلێڤانەیی

لە دێڕی دووەم سەرەتا وشەکانی (تۆ) و (مەزن) هاتوونە، دواتر لە بەرانبەریان وشەکانی (دڵ) و (بچیك) هاتوونە، (دڵ) لە بەرانبەر (تۆ) کە پەیوەندی نێوانیان (بۆیەك پێویستی)یە، دواتریش (بچیك) لە بەرانبەر (مەزن) هاتووە، کە پەیوەندی نێوانیان (دژیەك)یە، بەوەش (پێچە و پەخشی) دروستبووە.

ـ ئاشتی تەمی بنارگرتووی ئاخ و تاسەی
ڕەنجدەرانی کوردستان و هەندەرانە... ئەنوەر قادر محەمەد

لە بەشی یەکەمی گوتە وشەکانی (ئاخ) و (تاسە) هاتوون، دواتر لە بەرانبەریان دەستەواژەکانی (رەنجدەرانی کوردستان) و (رەنجدەرانی هەندەران) هاتوونە، (ئاخ) بۆ (رەنجدەرانی کوردستان) و (تاسە) بۆ (رەنجدەرانی هەندەران) هاتووە، بەوەش پێچە و پەخشی دروستبووە.

شایانی باسە پێچە و پەخشی بە گوێرەی بەرانبەر هاتن و نەهاتنی وشەکانی گروپی یەکەم و دووەمی دەکرێتە سێ جۆری (پێچە و پەخشی رێك) و (پێچە و پەخشی نارێك) و (پێچە و

پەخشی تێکەڵ). کە دواتر تیشکیان دەخەینە سەر.. سەبارەت بە ژمارەی وشە لێکپێچراوە بەرامبەر هاتووەکانیش دەشێت پێچە و پەخشی دوویی یان سێیی یان چواری و بەم شێوەیە هەبێت.

## ٢ـ پێچە و پەخشەی سێیی:

لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان سێ وشەنە، هەر وشـەیەکەیان لـە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە ڕێکی بێت، یان بە نـاڕێکی، پەیوەندی نێوانیشیان دەشێ هەر پەیوەندییەك بێت.. بۆ نموونە:

ـ من دەزانم دارستانی هەموو شوێنێك
جریوەی گەرمی چۆلەکەو
ڕووباری هەموو وڵاتێك
دەنگی تاڤگەو ڕەنگی کەف و پێچ و پەنای ڕێگەی بەرەو دەریای هەیە
بەڵام چ بکەم لێرە نەبێ
نە گوێم چاکیان دەبیسێت و
نە چاوم چاکیان دەبینێ و
نە گیانم چاکیان هەست دەکا... مارف ئاغایی

لەم کۆپلەیەدا لە دێڕی سێیەمدا (دەنگی تاڤگە) و (ڕەنگی کەف) و (پێچ و پەنای ڕێگە) بە پێکەوەپێچراوی هێنراون، دواتر لە دێڕەکانی شەش و حەفت و هەشت لە بەرامبەر ئەوانـدا بە ڕێکی سێ شت پەخشکراونەتەوە، ئەوانیش (گوێم چاکیان نابیسێ) بـۆ (دەنگـی تاڤگـە)، (چاوم چاکیان نابینێ) بۆ (ڕەنگی کەف)، (گیانم چاکیان هەست ناکا) بۆ (پـێچ و پـەنای ڕێ) هاتوون، بەوەش (پێچەوچەخشی ڕێکی سێیی) دروستبووە.

## ٣ـ پێچە و پەخشەی چوار بە چواری:

لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان چوار وشەنە، هەر وشەیەکەیان لـە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە ڕێکی بێت، یان بە نـاڕێکی، پەیوەندی نێوانیشیان دەشێ هەر پەیوەندییەك بێت.. بۆ نموونە:

ـ چیا بە قەد من

بەفری خۆش ویستبا
یا هەر چوار وەرزان بەفری دەماوە
یا خۆیشی لەگەڵ ئەوا دەتواوە
بەڵام داخەکەم
ئاواتم: ئاسمان، زەریا و چیایە
خۆیشم: ئەستێرە و ماسی و بەفرم... مارف ئاغایی

لەم کۆپلەیەدا لە دێڕی پێش کۆتایی وشەکانی (ئاوات) و (ئاسمان) و (زەریا) و (چیا) بە پێکەوەپێچراوی هاتوونە، لە پاشان لە دێڕی دواتردا لە بەرانبەر ئەوانەی پێشوو چوار وشەی تر بە ریزە (خۆم) و (ئەستێرە) و (زەریا) و (چیا) بۆیان پەخشکراونەتەوە. هەریەکە لە وشەکانی بەشی دووەم بە پەیوەندییەکی بۆیەك پێویستی و واقیعی بە وشەکانی بەشی یەکەم بەستراونەتەوە، بەوەش (پێچە و پەخشی رێکی چواری) دروست بووە.

## پێچە و پەخشی رێك و ناڕێك و تێکەڵ:

### ١- پێچە و پەخشەی رێك

ئەو (پێچە و پەخشە)یەیە، کە وشەکانی ریزی دووەمی بەڕێکی لە بەرامبەر وشەکانی بەشی یەکەمی دێن.. بۆ نموونە:

ـ حەفت رەنگی پەلکە زێڕینە
هەموو یەك ریز خۆ دەنوێنن
بۆ سروشت و دڵی مرۆڤ
جوانی و خۆشی دەپەخشێنن... مەدحەت بێخەو

لەم کۆپلەدا لە دێڕی سێیەمدا وشەکانی (سروشت) و (دڵی مرۆڤ) بەدوای یەکدا هێنراون و لێکپێچراون، ئەمە (پێچ)ەکەیە، دواتر لە دێڕی چوارەمدا وشەکانی (جوانی) و (خۆشی) بە ریزە بۆ ئەم دوو وشانەی سەروو پەخشکراونەتەوە، ئەوەش (پەخش)ەکەیە، کە بە رێکی لە بەرانبەر وشە پێچکراوەکان هاتوونە، بەوەش (پێچە و پەخشی رێك) بەرهەم هاتووە.

ـ منیش وەك ئێوە لە دنیای گەورە گەردێکم بچووك
هەتا ناشتوانم بفرِم بخوێنم بە باڵ بە دەنووك... گۆران

لەم دێڕەدا لە بەشی یەکەمی نیوە دێڕی دووەمدا، ڕستەکانی (بفڕم) و (بخوێنم) بە پێکەوەپێچراوی هێنراون، دواتر لە بەشی دووەمی هەمان نیوە دێڕدا بە ڕێکی دوو وشە بۆ ئەم دوو ڕستەیەی یەکەم پەخشکراونەتەوە، ئەوانیش (بە باڵ) بۆ (بفڕم)، (بە دەنوك) بۆ (بخوێنم)، بەوەش (پێچەوچەخشی ڕێکی دوویی) دروستبووە.

ـ ئێستێ گیرۆدەی بە دەستی دوژمنم
دێوی شەڕ دیارەو بۆیە من ونم... حەسەنی دانیشقەر

لەم دێڕەدا لە سەرەتادا دەبینین دوو وشەکانی (دێوی شەر) و (دیار) هاتوونە، لە دوای ئەوانیش دوو وشەکانی (من) و (ون) هاتوون، (من) لە بەرانبەر (دێوی شەڕ) کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی لەگەڵ یەك نەگونجان و ناکۆکییە، (ون)یش لە بەرانبەر (دیار) کە پەیوەندی نێوانیان (دژیەکی)یە، بەوەش پێچەوچەخشی ڕێك دروستبووە.

## ٢ـ پێچە و پەخشەی ناڕێك:

ئەو (پێچە و پەخشە)یەیە، کە وشەکانی ڕیزی دووەمی بە ناڕێکی لە بەرامبەر وشەکانی ڕیزی یەکەمیدا هاتبن.. بۆ نموونە:

ـ ئەگەر پێنووس و تفەنگ و چیا
ل پشتا من نەبن
نە ناڤ و شوێنوار دمێنن
نە زمان و فەرهەنگ دمێنن... ئەمین سندی

لەم پارچەیەدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە، سێ وشەی (پێنووس) و (تفەنگ) و (چیا) هاتوونە، لە پاشان لە بەشی دووەمی گوتەکەو لە بەرامبەر ئەوان، وشەکانی (ناڤ) و (شوێنوار) و (زمان و فەرهەنگ) هاتوونە، کە بە شێوەیەکی ناڕێك هەر یەکەیان بۆ وشەیەکی بەشی یەکەم دەگەڕێتەوە، بەم شێوەیە:

(ناڤ) بەرامبەر (تفەنگ) کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی (بەدوای یەکداهاتن)ە، چونکە تفەنگ هێمای بەرەنگارییەو بە هۆی ئەوەوە ناو دەمێنێت. (شوێنوار)یش بەرامبەر (چیا)، کە پەیوەندی نێوان ئەوانیش پەیوەندی (بۆیەك پێویستی)یە، چونکە ئەگەر چیا نەبێت، شوێنەواریش نامێنێت. ئینجا (زمان و فەرهەنگ)یش لە بەرامبەر (پێنووس)، کە پەیوەندی

نێوان ئەم دووانەش پەیوەندی (هۆیی)یە، چونکە ئەگەر پێنووس نەبێت، زمان و فەرهەنگیش نامێنێت. بەوەش (پێچە و پەخشی نارێك) بەرهەم هاتووە.

### ٣ ـ پێچە و پەخشی تێکەڵ ـ نادیار ـ

بریتییە لەو پێچەو پەخشەی کە کاتێك لە بەشی یەکەمی گوتە دوو شت، یان سێ شت، یان زیاتر دێن و لێکدەپێچرێن، لە بەشی دووەمی گوتەکە، لەبەرامبەر ئەوان بە قەد ژمارەی ئەوان شتی تر دێنەوە، بەڵام دیار نییە، کە کامە شتی بەشی دووەمی گوتە بە روونی بۆ کامە شتی بەشی یەکەم دەگەڕێتەوە، چونکە دەشێت هەریەکە لە وشەکانی بەشی دووەم بۆ هەردوو، یان هەرسێ وشەکانی بەشی یەکەم بگەڕێنەوەو لەگەڵیان هاوپەیوەندی بن.

بریتییە لەو پێچە و پەخشەی کە کاتێك لە بەشی یەکەمی گوتە دوو شت، یان سێ شت، یان زیاتر دێن و لێکدەپێچرێن، لە بەشی دووەمی گوتەکە، لەبەرامبەر ئەوان بە قەد ژمارەی ئەوان شتی تر دێنەوە، بەڵام دیار نییە، کە کامە شتی بەشی دووەمی گوتە بە روونی بۆ کامە شتی بەشی یەکەم دەگەڕێتەوە، چونکە دەشێت هەریەکە لە وشەکانی بەشی دووەم بۆ هەردوو، یان هەرسێ وشەکانی بەشی یەکەم بگەڕێنەوەو لەگەڵیان هاوپەیوەندی بن.. بۆ وێنە:

ـ لە بن سواندەی لانەی کپ و ناوگەڵاکان
مەل و کۆتر کۆڕدەبەستن
بۆ دەردی تەنیایی من و نەبوونی تۆ
مات و پەستن... مەدحەت بێخەو

لەم کۆپلەدا لە دێڕی دووەمدا وشەکانی (مەل) و (کۆتر) بەدوای یەکدا هێنراون و لێکپێچراون، ئەمە (پێچ)ەکەیە، دواتر لە دێڕی چوارەمدا وشەکانی (مات) و (پەست) بۆ ئەم دوو وشانەی سەروو پەخشکراونەتەوە، ئەوەش (پەخش)ەکەیە، بەڵام نادیارییەکی پێوە دیارە، ئاسان نییە بزانرێ، کامەیان بۆ کامە لە دوو وشەکانی پێشوو دەگەڕێتەوە، بەوەش (پێچە و پەخشی تێکەڵ ـ نادیار ـ) بەرهەم هاتووە.

ـ ئەوەی ئەمڕۆ دەناڵێنێ
دەگرییێ دادەداییێتی
جەرگسووتاوو

مالۆیران و

زامدارن له رووی گێتی... هەولێری

لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی یەکەمی، سێ شت، کە بریتینە لـە: (دەنـاڵێنێ) و (دەگریـێ) و (دادەدایێتی) هاتوونە، لە پاشان لە نیـوە دێـڕی دووەمیـدا لـە بەرامبـەر ئـەوان، وشـەکانی (جەرگسووتاو) و (ماڵوێران) و (زامدار) هاتوونە، کە بە شێوەیەکی نادیار هـەر یەکـەیان بـۆ وشەیەك، یان زیاتر لە وشەیەکی بەشـی یەکـەم دەگەڕێتـەوە، بـەم شـێوەیە: (جەرگسـووتاو) دەشێت لە بەرانبەر (دەگریێ) یان (دادەداد)یش هاتبێت، کـە پەیوەنـدی نێوانیـان پەیوەنـدی (لەسەریەك دروستبوون)ە، چونکە لەلایەك (جەرگسووتاو) بە کارەکی دەگرییێـت و لەولاشـەوە دادەدای دەبێـت لـە دەسـت ئـەو سـتەمکارەی جـەرگی سـووتاندووەو کوڕەکـەی کوشـتووە. (ماڵوێران)یش بە هەمان شێوە دەشێت (بگرییێـت) و دەشـێت (دادەدایشـی بێـت)، تەنانـەت دەشێت بەدەست ئەوبارەی تێی کەوتووە بە (دادەداد)یش بکەوێت. هەرچی (زامدار)ە، ئەویش دەشێت لە بەرامبەر هەر یەکە لە سێ وشەکانی سەروو بێت، کەوابێت، بە روونی دیـار نییـە، کە وشەکانی نیوە دێڕی دووەم، کامیان بۆ کامەی نیـوە دێـڕی یەکـەم دەگەڕێنـەوە، بـەوەش (پێچە و پەخشی تێکەڵ ـ نادیار ـ ) بەرهەم هاتووە.

ـ ئەگەر پێنووس و تفەنگ و چیا

ل پشتا من نەبن

نە ناڤ و شوێنوار دمێنن

نە زمان و فەرهەنگ دمێنن... ئەمین سندی

لەم پارچەیەدا لە بەشی یەکەمی گوتەکە، سـێ وشـەی (پێنـووس) و (تفـەنگ) و (چـیا) هاتوونە، لە پاشان لە بەشی دووەمی گوتەکەو لە بەرانبەر ئەوان، وشەکانی (ناڤ) و (شوێنوار) و (زمان و فەرهەنگ) هاتوونە، کە بە شێوەیەکی نادیار هەر یەکەیان بۆ وشەیەك، یان زیـاتر لە وشەیەکی بەشی یەکەم دەگەڕێتەوە، بەم شێوەیە: (ناڤ) دەشێت لە بەرانبەر (تفـەنگ) یـان (پێنووس)یش هاتبێت، کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی (بەدوای یەکـداهاتن و واقیعیـەت)ە، چونکە لەلایەك (پێنووس) شـتەکان تۆمـار دەکـات و بـە هۆیـەوەیان مێـژوو دەمێنێتـەوە، لەولاوەش (تفەنگ) هێمای بەرەنگاریەو بە هۆی ئەوەوە میللەت بـە ئـازایی ناودەردەکـات و مانەوەی دەبێت، (شوێنوار)یش دەشێت لـە بەرانبـەر (چـیا)، یـان لەبەرانبـەر (تفـەنگ) و

(پێنووس)یش هاتبێت، کە پەیوەندی نێوان ئەوانیش پەیوەندی (بۆیەك پێویستی و واقیعی)یە، چونکە ئەگەر (چیا) و (پێنووس) و (تفەنگ) نەبن، ئەوا شوێنەواریش نامێنێت و هەموویان وەکو یەك گرنگن بۆ مانەوەی شوێنەوار و دروستکردنی. هەرچی (زمان و فەرهەنگ)ە، ئەمە بە تەنیا دەشێت لە بەرانبەر (پێنووس) هاتبێت، کە پەیوەندی نێوان ئەم دووانەش پەیوەندی (هۆیی)یە، چونکە ئەگەر پێنووس نەبێت، زمان و فەرهەنگیش نامێنێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لاری نییە ئەگەر (ناڤ)ەکە بۆ (تفەنگ) و (چیا)ش بگەڕێنرێتەوە، چونکە ئەگەر ئەوانیش نەبن، کە هێمای مانەوەو خۆسەپاندنن، ئەوا دەشێت (زمان و فەرهەنگ)یش کاریگەری خراپیان بەسەردا بێت و لەناو بچن، بەوەش (پێچە و پەخشی تێکەڵ ـ نادیار ـ ) بەرهەم هاتووە.

### جیاوازی نێوان بەرامبەری و پێچە و پەخشە:

لە (بەرمبەری)دا، هەمیشە وشە بەرامبەرەکان، ئەگەر چوار بن و ئەگەر شەش و ئەگەر هەر چەندێکیش بن، پەیوەندی نێوانیان، پەیوەندی دژیەکییە، بەڵام لە (پێچە و پەخشە)دا پەیوەندی نێوان دوو بەرامبەرەکان دەشێت پەیوەندی بە دوای یەکدا هاتن، یان بەیەکەوە گونجان، یان لە هەندێ جاردا دژیەکی و هەر پەیوەندییەکی تریش بێت.

### جوانی بایس:

لە عەرەبیدا (حسن التعليل)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی ئەدیب بە ئاشکرا، یان بە پۆشراوی هۆی زانراوی شتێك پشتگوێ بخات و بێت هۆیەکی ئەدەبی جوان بۆ شتەکە بێنێتەوە، کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەوەی مەبەستیەتی.. واتە ئەو هۆیەی شاعیر بۆ دۆخەکانی دێنێتەوە زادەی خەیاڵی شاعیرانەی خۆیەتی، نەك هەڵقوڵاوی واقیع و راستەقینە.

بە واتایەکی تر: جوانی بایس لێکدانەوەی تایبەت و شاعیریانەی شاعیرە بۆ ئەو بار و دیاردانەی لە سروشت، یان لە دەوروبەری خۆی روودەدەن، بەڵام بێ ئەوەی باس لە هۆیە زانستی و دروستەکەیان بکات، کە لەبەرچی وەهان، چونکە هێنانەوەی هۆی دروست ئیشی زاناکانە، نەك ئیشی شاعیر. بۆ نموونە:

ـ ئەم ئاسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە
تەحلیلی وا کراوە، کە قوبەی غەمە، تەمە... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا شاعیر کە باس لە ڕەنگی شینی ئاسمان دەکات، دەڵێت ئەمە لەبەر ئەوەیە، وەکو گوتویانە: ئاسمان قوببەی غەمەو ئەو غەمە تەمێکی گەورەی غەم و خەفەتی دروستکردووە، بۆیە وا دیارە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە لێکدانەوەی شاعیرانەیە بۆ دۆخەکە، ئەگینا هۆی ڕاستەقینەی شینی ئاسمان شتێکی ترە، ئەویش ئەوەیە، کە کوتلەیەکی غازی گەورە بەری ئاسمانی دنیای گرتۆتەوە، ئەوەیە لە دووردا بەو ڕەنگە خۆی پیشان دەدات، نەك لە واقیعدا وەها بێت.

ـ ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بە شەو
وەك من بە داخەوەن نە سرەوتیان هەیە نە خەو... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا شاعیر باس لە (ئەستێرە بەرزەکان) دەکات، کە بە شەو دەدرەوشێنەوەو جوانن، وای لێکدەداتەوە، کە ئەوانیش چ سرەوت و چ خەویشیان نییە و وەکو شاعیر غەمبارن، بۆیە ناخەون و لە درەوشانەوەی خۆیان بۆ ساتێکیش ناکەون و هەر تیشك بڵاودەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەستێرەکان وەکو ئادەمیزاد نینە پێویستییان بە خەو و سرەوتن بێت، بەڵکو هەر سروشتی خۆیان وەهایە، تا خۆر پەنهان بێت لە زەوی، ئەوان لە دڵی ئاسماندا بەو تیشکەی لە خۆریان وەرگرتووە جوان بدرەوشێنەوە، کە خۆریش دەرکەوت، ئەوان وردە وردە تیشکەکانیان کزبێتەوە تا بگەنە ئاستی نەمان.

ـ دڵسۆزی وام نەدی بوو، کە بۆم بگری وەك خەشیم
فرمێسکەکەی ئەوان بوو، بە ئاونگی تێگەییم... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا شاعیر درێژە بە باسی ئەستێرەکان دەدات، کە لە دێڕەکەی پێشووش باسی کردبوون، دەڵێت: هێندە بەزەییان بە من هاتۆتەوە، شەو تا بەیان بە غەشیمی بۆم دەگریان، ئەوەتا ئەو دڵۆپە ئاوانەی بە (ئاونگ)یان تێگەییم، ئەوە فرمێسکی ئەوانە نەك ئاونگ، ئەوەش دیارە لێکدانەوەی شاعیرانەیە، ئەگینا ڕاستەقینە نییە، ئاونگ لە فرمێسکی ئەستێرەکان دروست نابێت، چونکە ئەستێرەکان گریانیان نییە و فرمێسکیان لێ بەرنابێتەوە، بەڵکو دروستبوونی ئاونگ مەسەلەیەکی دیکەیە، پەیوەندی بە شێ و هەواوە هەیە، بۆیە لە هەندێ وەرزدا بەیانیان رووەك ئەو ئاونگانەیان لەسەر گەڵاکان دروست دەبێت.

ـ پیرێژنێکە هەر شەوەی شوویەك ئەکا بە خەڵق
سوراو بە خوێنی مێردی ئەکا، پێی ئەڵێن شەفەق... پیرەمێرد
لەم دێڕەدا شاعیر دەڵێت دنیا هەر شەوەی شــوو بــە یــەکێك دەکـات، بەرەبـەیان خـوێنی دەڕژێت و بەوەیە سوورییەکەی رووخساری دەردەکەوێت، خەڵك نازانن، دەڵێن: ئەوە شەفەقە.
لە راستیشدا سوورایی شەفەق بەو هۆیەوە دروست نابێت، دنیا چ مێردێکی نییە و کـەس ناکوژێت، بەڵکو بە هۆی دەرکەوتنی خۆرێکی نوێوە ئەو سوورایییە دەردەکـەوێت و دیمـەنێکی جوان دەبەخشێت، بەڵام لێکدانەوەکەی شاعیر لێکدانەوەیەکی جوانبینیانەی شاعیرانەیە.

ـ گوڵاڵە بە رەنگ سوور ئەکاتەوە
وەك من داغدارە لە بنیاتەوە... پیرەمێرد
شاعیر دەڵێت گوڵاڵە بۆیە رەنگی سوور دەچێتەوە، چونکە لە بنجدا وەکو من داغدارە، لـە راستیشدا گوڵاڵە لەبەر چ داغێك ئەو رەنگەی نـەگرتووە، بـەڵکو ئـەقڵی نییـە داغ بـۆ هـیچ هۆیەك هەڵبکێشێت، بەڵام هەر رەنگی ئاسایی خۆی وەهایە، کەچی شاعیر وەکـو ئـادەمیزاد تەماشای دەکات، دەڵێت: چۆن من کە غەم دامدەگرێت سووردەبمەوە، گوڵاڵەش کە سوورە هەر بەو هۆیەوەیە، کە غەم دایگرتووە.

ـ ئاهوو نزای کوردکانی شیمال گەییە ئاسمان
بەو دووکەڵی هەناسەیە، ئاو دێ لە دیدەمان... پیرەمێرد
شاعیر دەڵێت بەو دووکەڵی هەناسەیە، کە لە سینەی کوردەکان دەرچوو، چاومان برژایەوەو ئاوی لێهات، بەڵام لە راستیدا دووکەڵ لە سینە دەرنایەت و چاو بەوە نابرژێتەوە ئاو دەربدات! بەڵکو گریانەکە بە هۆیەکی تر دەبێت، ئەویش ئەوەیە، کە مرۆڤ لە کاتی برینداربوونی هەستی و هەڵقوڵانی سۆزی جا بە هەر هۆیەکەوە بێت گریانی دێت.

ـ بڕوانە ئاسمان بووەتە پەڵکی زەرد و سوور
گیانی زەهاوییە، کە ئەدرەوشێتەوە لە دوور... پیرەمێرد
شاعیر باس لە پەڵکەکانی پەڵکەزێڕینە دەکات، دەڵێت ئەو پەڵکانە گیانی (زەهاوی)نە لە دوورەوە دەدرەوشێنەوە، ئەوەش راستەقینە نییەو خەیاڵی شاعیرانەیە، چونکە لە راستیدا گیان

لە جیهانی هەستپێکراوەکان نییە و نابینرێت، بەڵام خۆشەویستی شاعیر بۆ (زەهـاوی)، ئـەوە وای لێدەکات ئەو پەلکانەی پەڵکە زێڕینە، کـە لـە دوای بـاران لـە هەنـدێ کـاتی تایبەتـدا دروستدەبن، ئەو لێکدانەوەیان بۆ بکات و بەوەش بییەوێ بڵێ: ئەوە زەهـاوی هـەر زینـدووەو ئەوەتا لەوێوە پێمان پێدەکەنێت.

ـ گوڵە بەڕۆژە عاشقی تەواوە
ئەسوڕێتەوە روو لە هەتاوە... پیرەمێرد

شاعیر دەڵێت: گوڵەبەڕۆژە بۆیە هەمیشە رووی لە هەتاوەو لەگەڵ ئەو دەسوڕێتەوە، چونکە عاشقیەتی و عاشقی تەواویش کاری وەها دەکات، بـەڵام ئـەوەش راسـتەقینە نییـە، چـونکە گوڵەبەڕۆژە لەبەر ئەو هۆیە نییە، کە رووەو خۆر دەسووڕێتەوە، بـەڵکو سـووڕی ژیـانی خـۆی وەهایەو خودا بەو شێوەیەی ژیان بۆ داناوە.

ـ پەڵکە زێڕینەی پاش بارانی زۆر
چەماوەتەوە بەرانبەر بە خۆر... گۆران

وێنەی پەڵکەزێڕینە، کە لە دوای بارانی بەهاران دروست دەبێـت، شـێوەیەکی چـەماوەیی هەیە، چونکە لە بەرزییەوە بەرەو خوار دەکەوێتە بەرچاو، ئەوەش بە چ مەبەسـتێکەوە نییـە، بەڵام شاعیر وای پیشان دەدات، ئەوە بـۆ رێزگـرتن لـە خـۆر چـەماوەتەوە، کـە لـە راسـتیدا پەلکەزێڕینە لەسەر بنەمای رێزگرتن و رێزنەگرتن مامەڵە ناکـات، کـەوابێت ئـەوەی شـاعیر دەیڵێت، هۆی شاعیرانەیە، نەك هۆی دروست، کە پەلکەزێڕینە بەوشـێوەیە، ئـەوەش (جـوانی بایس)ە.

ـ مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو
زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کەو... گۆران

لە شەودا مانگ دەردەکەوێت و دواتر لەگەڵ نزیکبونـەوەی بـەیانی و خۆرهـەڵاتن، وردە وردە شەوق و زەوقەکەی شەوی نامێنێ، کز و لاواز و زەرد و بێ شەوق دەبێ، تا لـە رۆژدا ون دەبێت، هۆی ئەو لاوازی و کزبوون و ونبوونەشی دەرکەوتنی خۆرە، بەڵام شاعیر دەڵێت: هـۆی ئەمە بە هۆی ترسی مانگە، لە قاسپە قاسپی کەوی بەیانی، کە دیارە لەوکاتەی خۆرهەڵـدێ،

لەلاییێك (کەو)یش وەکو هەر باڵدار و گیانداریێکی تر لە خەو رادەبێت و دەکەوتە جموجۆڵ، بۆ ئەوەش دەقاسپێنێ و ئەندامەکانی دەستەکەی خۆی وشیاردەکاتەوە، کە هەڵسن کاتی کار و کۆششە، لەولاشەوە لەوکاتەدا، چونکە خۆر بە تاوتر و بە شەوقترە، بۆیە مانگەکە تینی تیانامینێ و کز دەبێت، هۆی راستەقینە ئەوەیە، چونکە مانگ پەیوەندی بە کەوەوە نییەو لە کەو ناترسێت، دواتر مرۆڤ نییە لە ترسان رەنگی زەرد بێت، بەلاّم ئەو هۆیەی شاعیر بۆ زەردبوونی مانگ دەیهێنتەوە، خەیاڵی شاعیریانە دروستی دەکات، ئەوەش (جوانی بایس)ە.

ـ لە لێوار حەوزا گولاّڵەو بەیبون
ساوان ئەلەرزن لە تاو نقومبوون... گۆران

شاعیر دەڵێ گولاّڵەو بەیبونی سەر رۆخی حەوز وەکو ئادەمیزاد وەهان، کە لە بەرزاییدا سەر بۆ خوارەوە شۆڕدەکەنەوەو چاویان بە ئاوی زۆری ناو حەوزەکە دەکەوێ، ترسی ئەوەیان لێ دەنیشێ، بکەونە ناو ئەو ئاوەو بخنکێن، بۆیە دەلەرزن، بەلاّم ئەو هۆیەی شاعیر بۆ ئەو ترس و لەرزینەی ئەم گولاّنەی دەهێنێتەوە، هۆی دروست نییە، چونکە ئەمانە ئەقڵیان نییە تا بترسن، دواتر خنکان و نقومبوون دووچاری ئەوانە نایێ، بەلاّم بۆیە دەلەرزن، چونکە با لێیان دەدات و دەهەژێن، یان شەپۆلی ئاو جار جارە کە بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە لە قەدەکانیان دەدات و دەیانهەژێنێ، ئەوە هۆی دروستە، شاعیر ئەمە لەبیرە خۆی دەباتەوەو بە خەیاڵی شاعیریانەی خۆی هۆیەکی دیکە دروست دەکات، ئەوەش (جوانی بایس)ە.

ـ تریفەی مانگە شەو لەسەر کەل و گرد
باسی یەکبوونی گەلی کوردییەکرد... خورشیدە بابان

تریفەی مانگ، چونکە بە دەوری مانگەکە دروست دەبێت شێوەکەی بازنەییەکی خڕ و یەکپارچەییە، شاعیر دەڵێت: ئەوە بۆیە وایە، چونکە باسی یەکبوونی کورد دەکات و دەیەوێت تێمان بگەینێت، کە کورد دەبێت یەکپارچە بێت، ئەوەش خەیاڵێ شاعیرانەیە، دەنا تریفەی مانگەشە و هەقی بەسەر یەکبوون و یەکنەبوونی چ گەل و نەتەوەیەکەوە نییە، بەم شێوەیە (جوانی بایس)ێکی جوان دروست بووە.

**کۆکردنەوە:**

(کۆکردنەوە) لە عەرەبیدا (الجمع)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو شت، یان زیاتر لە ژێر بەیداخی بڕیارێکەوە.. بۆ وێنە:

ـ خۆزگەم بە خۆت کە لە شارستان دووری

سەربەست و دڵپاك و شاد و مەسرووری... بەختیار زێوەر

سەربەست و دڵپاك و شاد و مەسروور چوار سیفەتن لەژێر سیفاتەکانی (ئەو)دا کۆکراونەتەوە.

ـ کە سەیری کورد ئەکەم وا تێئەگەم کوردێکی خنکاوە

بە دوو کەس کووشتوویانەو ناشتوویانەو خوێنی فەوتاوە... بەختیار زێوەر

کووشتوویانە و ناشتوویانە و خوێنی فەوتاوە سێ سیفەتن لەژێر سیفاتەکانی (ئەو)دا کۆکراونەتەوە.

ـ باوا (صەلاح)ی قارەمان

عەرەب و تورك و فارس و کورد

وەکو برا سەربازی بوون... جەلالەدین نەجمەدین

(عەرەب) و (تورك) و (فارس) و (کورد) لەژێر پەسنەکانی (برا)یەتی و (سەربازبوونی سەلاحەدینی ئەیوبی)یەوە کۆکراونەتەوە، بەوەش هونەری (کۆکردنەوە) بەرهەم هاتووە.

ـ هەرکوێیەکت بەدی ئەکەم، ئەڵێم: ئۆخەی

هەر کوێیەکت بەدی ناکەم، ئەڵێم: خۆزگە

من بە خۆزگەو ئۆخەی ئەژیم... حەسیب قەرەداغی

(خۆزگە) و (ئۆخەی) لەژێر بڕیاری من بەوانەوە ئەژیم کۆکراونەتەوە، ئەوەش کۆکردنەوەیە.

ـ سێ تکەن ئازادی هێنن

فرمێسك و ئارەقەو خوێنن... خدر کۆساری

(فرمێسك) و (ئارەقە) و (خوێن) لەژێر بڕیاڕی (هێنانی ئازادیدا) کۆکراونەتـەوە، بـەوەش هونەری (کۆکردنەوە) بەرهەم هاتووە.

**چەند جۆرێکی کۆکردنەوە:**

**١ـ کۆکردنەوەی ناو**

لێرەدا (کۆکردنەوە) لە نێوان دوو (ناو) یان زیاتر دەکرێت.. بۆ وێنە:

ـ گومەزە مەندیل سپیەکان

چۆڵبوون لە

کۆتر و چۆلەکە و

بولبول و باڵندە عاشقەکانی تر... فوئاد کەڵوڕی

(کۆتر) و (چۆلەکە) و (بولبـول) و (باڵنـدە عاشـقەکانی تـر) چـوار شـتن لـەژێر بڕیـاڕی (چۆلکردنی گومەزە مەندیل سپییەکان) کۆکراونەتەوە، بەوەش هونەری (کۆکردنەوە) بەرهـەم هاتووە.

ـ خۆفرۆشتن و فێڵ و تەفرەدان

نەخۆشییەکە کوشندە و بە ژان... خوشکە بێخەو

سێ شـتەکانی (خۆفرۆشـتن و فێـڵ و تـەفرەدان) سـێ نـاوی واتـایین، لـەژێر خاسـەوێژی (نەخۆشییەکە) کۆکراونەتەوە.

**٢ـ کۆکردنەوەی فرمان**

لێرەدا (کۆکردنەوە) لە نێوان دوو (فرمان) یان زیاتر دەکرێت.. بۆ وێنە:

ـ شێرکۆ، رۆڵەکەم: راکە

زووکە، وەرە، خێراکە

مەگری، مەچۆ بەرِکا

کوڕی ژێر کەی وائەکا.. باوکی ئازیز

وشەکانی (ڕاکە ـ زووکە ـ وەرە ـ خێراکـە ـ مـەگری ـ مەچـۆ) هـەر شەشـیان فرمـانی داخوازین، چواری یەکەمیان بە (ئەریّ)و دووەکەی تریـان بـە (نـەریّ).. هـەر هـەموویان بـۆ پەسنی (کوڕی ژیر) کۆکراونەتەوە، کە دەبیّ لەم سیفەتانەی هەبیّ.

### ٣ـ کۆکردنەوەی دەستەواژە

لێرەدا (کۆکردنەوە) لە نێوان دوو (دەستەواژە) یان زیاتر دەکرێت.. بۆ وێنە:

ـ ئەم سەدەیە
سەدەی دزینی عاتیفەو
کەولکردنی پەیمان و
مەزاتکردنی بۆچوونە... رێدار سابیر

(دزینی عاتیفە) و (کەولکردنی پەیمان) و (مەزاتکردنی بۆچوون) سـیّ دەسـتەواژەنە، بـۆ پەسنی (ئەم سەدەیە) کۆکراونەتەوە، بەوەش هونەری (کۆکردنەوە) بەرهەم هاتووە.

### کۆکردنەوە لەگەڵ روونکردنەوە:

لێرەدا دوو شت یان زیاتر لەژێر بەیداغی بڕیارێك کۆدەکرێنەوە، دواتر بە جیا یەکە یەکەی ئەو کۆکراوانە روون دەکرێنەوە.. بۆ نموونە:

ـ من ئەو کوردەم لەوەتەی بووم
بەشم هەر ئەشکەنجە و ژان بوو
مێژووی دێرینم سەراپای
مەرگەسات و لێقەومان بوو
(کۆڕش) کۆرپەی (میدیا)ی کوشتم
بە لێشاو خوێنی لیّ رشتم
نەك هەر (کۆڕش) چەندانی تر
هەر ستەمکارێك کە دەهات:
سەری لاوی دەقرتاندم
کۆرپەی ساوای دەفڕاندم
شووشەی ئابڕووی دەشکاندم

دووبەرەکی تیا دەچاندم
قەڵای هیوای دەڕووخاندم
چی پەتپەتی و
دەردیسەری ژیان هەیە
چی مەینەتی و چارەڕەشی جیهان هەیە
(ساسانییەکان) پێیان کردم
لە خۆ و لە ژینم بێزار بووم... جەلالەدین نەجمەدین

لەم پارچەیەدا سەرەتا (مەرگەسات و لێقەومان) وەکو دوو پەسن بۆ (مێژووی دێرینم) کۆکراونەتەوە، ئینجا دواتر شاعیر هاتووە، ئەو (مەرگەسات و لێقەومان)ەی زیاتر روون کردۆتەوە، ئەوەتا دەڵێت:

١ـ (کۆڕش) کۆرپەی (میدیا)ی کوشتم
بە لێشاو خوێنی لێ ڕشتم
٢ـ هەر ستەمکارێك کە دەهات:
سەری لاوی دەقرتاندم
کۆرپەی ساوای دەفڕاندم
شووشەی ئابڕووی دەشکاندم
دووبەرەکی تیا دەچاندم
قەڵای هیوای دەڕووخاندم
٣ـ چی پەتپەتی و
دەردیسەری ژیان هەیە
چی مەینەتی و چارەڕەشی جیهان هەیە
(ساسانییەکان) پێیان کردم

بەم شێوەیەش لەم پارچەیەدا (کۆکردنەوە) و (روونکردنەوە) بەرهەم هاتووە، کە تاکو ئێستا نە لای رەوانبێژانی کورد و نە لای رەوانبێژانی عەرەبیش بەرچاوم نەکەوتووە، نموونەی وەهایان هێنابێتەوەو باسیان لە هونەرێکی لەو شێوەیە کردبێت.

**لێككردنەوە:**

(لێككردنــەوە) لــە عـەرەبیــدا (التفریــق)ی پێــدەگوترێت.. بــە تــەواوی پێچــەوانەی كۆكردنەوەیە.. لە (كۆكردنەوە)دا دوو شت، یان پتر، لە فرمانێك یان خاسە وێژێك و (بڕیارێك) كۆدەكرێنەوە، كەچی لێرەدا دوو شت یان زیاتر كـە پێكـەوە دێـن، لێكدەكرێنــەوەو جیـاوازی نێوانیان دەخرێتەڕوو.. بۆ وێنە:

ـ ئەم قەومی كوردە زۆر گەورەی بووە

بەڵام هەر یەكەی بۆ لایەك چووە

نادر و كەریم خان كەوتوونە ئێران

عەزیزی میسرە سەلاحەدینمان... پیرەمێرد

لەم دوو دێڕەدا شاعیر باس لە كەسایەتییە گەورەكانی گەلی كورد دەكات، لە پاشان سـێ لەو گەورانە لە یەكتر جیـا دەكاتــەوە، بــەوەی كــەوا دووانیــان، كــە (نــادر و كــەریم خــان)ن كەوتوونەتە ئێران و (سەلاحەدین)یشمان كەوتۆتە میسرو بووەتە عەزیزی ئەوێ، ئەوەش لێـك كردنەوەیە.

ـ ئێمە خشتی بنیاتنان و

ئێوە پاچی رووخاندنن

ئێمە ئاواتی ژیان و

ئێوە مایەی مراندنن...دڵزار

لەم دوو دێڕەدا شاعیر باس لە ئێمە و ئەوان دەكات، لەوەدا لێكیان دەكاتەوە، كـە (ئێمــە ئاواتی ژیان) و (ئەوان مایەی مراندنن). ئەمەش لە خۆیدا شانازییە بــە ئێمــەو شــكاندنە بــۆ ئەوان.

ـ كوڕگەل بە گاڵــتە بڵێن بە دوژمن

كەوتن بۆ ئەوەو سەركەوتن بۆ من... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا (من) و (دوژمن) هەردووكیان ئادەمیزادن، شاعیر بەوە لێكیكردوونەتەوە، كە كەوتن دەبێتە بەشی دوژمن و سەركەوتنیش دەبێتە بەشی من.

- من دەریام و تۆ رۆخمی
من بە تۆ هەم .. تۆ بە من هەی
هەبی ئەبم.. نەبم نابی
خۆت نامینێی لە ناوم بەی... وریا عومەر ئەمین

سەرەتا من و تۆ لێك كراونەتەوە، بەوەی كەوا من دەریام و تۆ رۆخی ئەو دەریایەی منی، كەچی دواتریش بوونی من و بوونی تۆ لە یەكتری كراونەتەوە بوونی من بە هۆی تۆ و بوونی تۆ بە هۆی منە، ئەوەش لێككردنەوەیەكی ترە.

- لەبەر دەرگای بەگ چاوەڕێ وەستاو
هەندێك زین پۆشتە هەندێك ناتەواو... گۆران

گۆرانی شاعیر دوو دەستە خەڵكی لەبەر دەرگای بەگ لێكدەكاتەوە، یەكەمیان پۆشتەو ئەوی دیكەیان ناتەواوە، ئەوەش لێككردنەوەیە.

- كە ناوت دێنم
جەستە لێرەو رۆح لە مەككەم بۆ دیدارت
یا رەسوڵەڵلا... فوئاد كەهوڕی

شاعیر لەم كۆپلەیەیدا لە بەردەم پێغەمبەری خودا (درود و سڵاوی خودای لەسەر بێ)، جەستەو رۆحی لێكدەكاتەوە، بەوەی یەكەمیان لەگەڵ ناوهێنانی حەزرەتی رەسولوڵڵا (درود و سڵاوی خوای لەسەر) لێرە دەمێنێتەوە، چونكە ناتوانێ بگاتە ئەو شوێنەی تۆی سەروەری لێیە، بەڵام رۆحم جیادەبێتەوەو دەگاتە مەككە، ئەوەش لێككردنەوەیە.

- هێندە بۆ یەكتری سووتاوین
تا بووین بە دوو تابلۆی خەڵوز
بەم دیمەنە
ناحەزان بزە ئەیگرتن
ئازیزانیشمان ئەیانوت هەزار ئەفسووس... رێدار سابیر

لێرەدا لە بەرامبەر دیمەنێکدا، دۆست و ناحەزان لێککراونەتەوە، ناحەزان بزە ئەیانگرێ و ئازیز و دۆستانیش داخ و پەژارە.

ـ شیعر پرسیارم لێ دەکا
ماڵ زیندانی تاکەکەسی
نیشتمان زیندانی گشتی
ڕۆژئاوا تاراوگەیەکی هەمیشەیی
ئەتۆ کامیان هەڵدەبژێری... مارف ئاغایی

لەم کۆپلەیەدا شاعیر (ماڵ) و (نیشتمان) و (تاراوگە)ی لێککردۆتەوە، کە ئەمانە هەریەکەو بە جۆرێك لە جۆرەکان زیندان و ناخۆشین، جا کامەیان هەڵدەبژێری.

ـ ئەستێرە
فرمێسکە زیوینیەکانی
بۆ پرسەی شەو هەڵئەڕێژێ
منیش لێرە
دەستی فیراق
کۆرپەلەی بەختم ئەنێژێ... ڕێدار سابیر

لەم کۆپلەیەدا لە دوو کردەوەو وەسفی لەیەکجیا من و ئەستێرە لێککراوینەوە، ئەوەش لێککردنەوەیە.

**دابەشکردن:**

(دابەشکردن) لە عەرەبیدا (التقسیم)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە سەرەتا باسکردنی چەند شتێك، لە دواتریش بە جیا بۆ هەر شتەی شتی تر زیاد بکەیت.. بۆ وێنە:

ـ هەق و ناهەق
ئەگەر هەقە
تاڵە وەك ژەهری مار وایە
بەدڕەوشت خۆشی لێ نایە

گەر ناهەقە
ئەمە با ناشرینیش بێ
با ئاشکرا لاسەنگ و بێ بەهانەش بێ
بەڵام بەد هەر مەبەستیەتی
چونکە بوونی بە بوونیەتی... ئیدریس عەبدوڵڵا

شاعیر لە سەرەتا دوو چەمکی (هەق) و (ناهەق)ی هێناوە، دواتر بە جیا بۆ هەرشتەی شتێکی بەشیوەتەوە، بەوەش (دابەشکردن) بەرهەم هاتووە.

ـ چیا بە قەد من
بەفری خۆش ویستبا
یا هەر چوار وەرزان بەفری دەماوە
یا خۆیشی لەگەڵ ئەوا دەتواوە... مارف ئاغایی

لەم کۆپلەیەدا وشەکانی (چیا) و (بەفر) لە سەرەتاوە هێنراون، لە پاشاندا بە جیا بۆ هەریەکەیان شتێك بەخشراوەتەوە، بەوەش (دابەشکردن) بەرهەمهاتووە.

ـ خۆشم دەوێی لێشت تورەم
خۆشەویستیم دەریایەکە
تورەییم دڵۆپ
زۆر جار دڵۆپ
ئەم دەریایە هەڵدەلووشێ... مارف ئاغایی

لە سەرەتادا شاعیر خۆشویستن و توورەیی هێناوە، دواتر بە جیا بۆ هەریەکەیان شتێکی بەشیوەتەوە، بەوەش (دابەشکردن) بەرهەمهاتووە.

ـ من و مۆم و شەو
من تەنیایی
مۆم سووتان
شەو خامۆشی

هەرسێکمان

لە سێ جیهانی جیاواز داین... بێلاف

شاعیر لە سەرەتای ئەم هۆنراوەی سێ شتی وەکو (من) و (مۆم) و (شەو)ی هێناوەتەوە، دواتر تەنیایی بۆ من و خامۆشی بۆ شەوو سووتان بۆ مۆم بەشراوەتەوە، بەوەش (دابەشکردن) بەرهەمهاتووە.

## لێککردنەوە لەگەڵ دابەشکردن:

(التفريق مع التقسيم) لێرەدا دوو شت یان زیاتر کە پێکەوە دێن، لێکدەکرێنەوەو جیاوازی نێوانیان دەخرێتەڕوو.. ئینجا لە دواتریش بە جیا بۆ هەر شتە، لەو باسکراوانەی سەروو شتی تر زیاد دەکەیت.. بۆ وێنە:

ـ تۆ زێڕی .. زۆر پایەداری

من بەردێکم نزم و هەرزان

نە من تۆزقاڵێ سەرکەوتم

نە تۆ کەوتی.. کە تۆم شکان... وریا عومەر ئەمین

لە لەتەدێڕی یەکەم تۆ بە زێڕی و زۆرپایەداری و لە لەتی دووەم من بە بەردێکی نزم و هەرزان لێککراوینەتەوە، کە ئەمانە دوو و سەصفی پێچەوانەی یەکن، بەوەش لێککردنەوە بەرهەمهاتووە، دواتر بۆ من (نە تۆزقاڵێ سەرکەوتن) و بۆ تۆ (نە کەوتن) بەشراوەتەوە، ئەوەش دابەشکردنە، بەوەش لێککردنەوە لەگەڵ دابەشکردن دروستبووە.

## کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن:

(کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن) لەعەرەبیدا (الجمع مع التقسيم)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو شت یان زیاتر لەژێردەواری بڕیارێك یان خاسە وێژێك، دواتریش بە جیا بۆ هەر شتەیان شتی تر زیاد بکرێت، بۆ وێنە:

ـ ئەمین زەکی بەگ، صالح زەکی بەگ

ئەم دوو زیرەکە دوو شوعلەن یەك یەك

ئەمین زەکی بەگ پێشکەوت ئەمڕۆ دێ

صالح زەکی بەگ دوای ئەو ئەکەوێ... پیرەمێرد

لەم دوو دێڕەدا سەرەتا (ئەمین زەکی بەگ) و (صالّح زەکی بەگ) لە ژێر حوکمی یەك شوعلەییدا کۆکراونەتەوە، دواتر لە دێڕی دووەم بۆ هەر یەکەیان بە جیاو بە دەستنیشانکردن شتێك زیادکراوە، (پێشکەوت) بۆ (ئەمین زەکی) و (دوای ئەو ئەکەوێ) بۆ (صالح زەکی). ئەمەش (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن)ی پێدەگوترێت.

ـ دانیشتبووین لەگەڵ یار
من سەرمەست و ئەو هۆشیار... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی یەکەم (ین)ی راناوی کەسی یەکەمی کۆ، کە بۆ شاعیر دەگەڕێتەوە، لەگەڵ (یار)دا لە ژێر حوکمی (دانیشاتن)دا کۆکراونەتەوە، لە پاشان لە نیوە دێڕی دووەم، بە شێوەیەکی ئاشکرا (سەرمەست) بۆ شاعیر و (هۆشیار) بۆ یار دابەشکراون. ئەمەش (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن)ی پێدەگوترێت.

ـ هەوەس پەرستی و شەیتان
هەردووکیان وەکو یەك وان
شەیتان چەواشەت ئەکات
ئەم بە زەویدا ئەتبات... جەمال بێدار

هەوەس پەستی و شەیتان لە وەکویەك وابیدا پێکەوە لە سەرەتای ئەم پارچەیەدا پێکەوە کۆکراونەتەوە، ئەوە کۆکردنەوەکەیە، ئینجا لە پاشان کاری چەواشەکردنی تۆ بۆ شەیتان و کاری بە زەویتدابردنیش بۆ هەوەسپەرستی بەشراوەتەوە، ئەوەش دابەشکردنەکەیە، بەوەش (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن) بەرهەمهاتووە.

ـ زۆر رقم لە شەڕە گایە
بەڵام هەرچەند مرۆڤێك و گایەك لەسەر
سەکۆی یاری شەڕەگادا
لە هەر سووچێکی دونیادا
وەك دوو دوژمن
ئامبازی یەکتری دەبن

بۆ گاکە ژیان دەخوازم

بەوەش بۆ مرۆڤەکەش مردن... لەتیف هەڵمەت.

لەم پارچەیەدا لە سەرەتاوە (مرۆڤ) و (گا) پێکەوە کۆکراونەتەوە، ئەوە (کۆکردنەوە)یە، لە پاشان خواستنی ژیان بۆ گاکەو خواستنی مردن بۆ مرۆڤەکە بەشراونەتەوە، ئەوەش دابەشکردنەکەیە، بەوەش (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن) بەرهەمهاتووە.

## دابەشکردن و کۆکردنەوە:

بریتییە لە پێکەوە هێنانی دابەشکردن و کۆکردنەوە لە کۆپلە، یان پارچە شیعرێکدا، بێ ئەوەی پەیوەندییەك پێکەوەیان کۆبکاتەوە.. بۆ نموونە:

ـ من لێت دوورم

تۆش لێم دووریت

ئەتۆ کەروێشکێکی ونبووی

دەوروبەری چوار سنووریت

منیش راوچیم و پێت ناگەم

لێوەکانت دەجولێن و

لێت تێناگەم... جەوهەر کرمانج

لە سەرەتادا (من) و (تۆ) هێنراوە، دواتر (کەروێشکێکی ونبووی دەوروبەری چوار سنووریت) دراوەتە (ئەتۆ)، دواتر کۆمەڵێك سیفەت پێکەوە کۆکراونەتەوەو دراونەتە (من)، بریتینە لە: (راوچیم) و (پێت ناگەم)، (لێت تێناگەم)، لە بەشی یەکەمدا دابەشکردن و لە بەشی دووەمیشدا کۆکردنەوە هەیە، ئەمەش جۆرێکی دابەشکردن و کۆکردنەوەیە، کە هەردووکیان لە یەك جیان و پەیوەندییان پێکەوە نییە، واتە دابەشکردنەکە لە شوێنێك و کۆکردنەوەکە لە شوێنێکی تردا دروستبووە.

## وەصفی لە بەرگی لۆمە:

وەصفی لەبەرگی لۆمە لە عەرەبیدا (**المدح بما يشبه الذم**)ی پێدەگوترێت.. ئەو گوتەیەیە، کە تیایدا شاعیر سەرەتا لە بەرگی لۆمە کۆمەڵە پەسنێکی خراپ، بۆ شتێ، یان

یەکێ ئاراستە دەکات، بەڵام لە پاشان بە شێوەیەکی تر بڕیار دەدات و دەریدەخات کە ئەو گوتانەی پێشووی کە لە بەرگی لۆمە دەبینران، نەك بە لایەوەی لۆمە نەبووە، بەڵکو وەصف بووە.. بۆ وێنە:

ـ ئەو جیهانەی تۆ دەتەوێ
هەرگیز لای من دەست ناکەوێ
جیهانی من
هەمووی غەمە
زەردەخەنەی
یەکجار کەمە
جیهانی من کەلاوەیە
جێی پەرتووك و هۆنراوەیە... عەبدوڵڵا پەشێو

شاعیر لەم پارچەیە دەڵێ: جیهانی من هەمووی غەمە، کەم زەردەخەنەیە، کەلاوەیە! هەموو ئەوەش شتی خراپن و بیر بۆ ئەوە دەبەن، بەم قسانەی لۆمەی خۆی بکات، بەڵام کە دواتر دەڵێت: جێی پەرتووك و هۆنراوەیە! دیارە ئەمانە شتی بەسوودن و بۆ وەصفکردن بەکاردێن، کەواش بێ مەبەستی شاعیر وەصفە، بەڵام لە بەرگی لۆمە پێشکەشی کردووە، دەنا مەبەستی لۆمە نییە.

ـ لێت نابوورم
چونکە فێڵت لە منیش کرد
تۆ خۆ نەخۆش و شەکەت بووی
چووی لە بڕی منیش
کارەکەت کرد!! ئیدریس عەبدوڵڵا

سەرەتا شاعیر روو لە بەرامبەر دەکات و دەڵێ لێت نابوورم، ئەوەش بیر بۆ ئەوە دەبات، لۆمەی بکات، بەڵام کە مەبەست تەوا دەکات، دەردەکەوێ، ئەوە مەبەستی لۆمە نییە، بەڵکو مەبەستی وەصفە، چونکە پێی دەڵێ: ئاخەر تۆ نەخۆش بووی، چۆن چووی لە بڕی من کارت کرد!! ئەوەش وەصفی لە بەرگی لۆمەیە.

**لۆمە لە بەرگی وەصف:**

(لۆمەی لە بەرگی وەصف) لە عەرەبیدا (**الذم بما يشبه المدح**)ی پێدەگوترێت، پێچەوانەی (وەصفی لە بەرگی لۆمەیە) بریتییە لەو دەربڕینەی، کە شاعیر تێیدا سەرەتا بە باشی ستایشی یەکێك، یان شتێك دەکات و پەسنی دەدات، بەڵام دواتر دەریدەخات، کە لە گوتەکەی مەبەستی لۆمەیە نەك وەصف.. بۆ وێنە:

ـ دەیبەنە سەربان لەوێ هەڵیەخەن

سفرە بۆ مارو مێروو رائەخەن... پیرەمێرد

شاعیر سەرەتا باس لە کاروکۆششی جووتیاران دەکات، کە ئەو شتەی وشکی دەکەنەوە، دەیبەنە سەر بان و لەوێ جێیدێلن، تا وشك دەبێتەوەو دواتر دەیکەنە زەخیرەی زستان، ئەمە گوزارشت لە ئیش و کار و دڵسۆزی و ماندوونەبوونی خەڵکی لادێ دەکات و بیر بۆ ئەوە دەچێ، شاعیر لەم سانەی مەبەستی بێ وەصفیان بکات، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: سفرە بۆ مار و مێروو رائەخەن! ئەمە کەوابێ لۆمەیان دەکات، بەوەی کەوا ئەو شتەی خواردنە کە لە سەربان هەڵیدەگرن، بە دەمی مار و مێروو و هاوشێوەکانیان پیس دەبێت و ناتوانن، یان ئاگایان لەوە نییە بیپارێزن، یان نایانپرژێتە سەر ئەوەی پاکی رابگرن، ئەوەش لۆمەیە، ئیدی بەدیار دەکەوێ، مەبەستی شاعیر (لۆمەی لە بەرگی وەصفە)، نەك مەبەستی وەصف بێ.

ـ نەڵێن نەڵێن هەرگیز نەڵێن

پیاوێکە بێ شەرتە و بەڵێن

شەیتانێکی بلیمەتە

یاری لەسەر هەزار پەتە

ڤایرۆس و میکرۆب دەچێنێ

هەزارەهای پێ دەمرێنێ...دڵزار

سەرەتا شاعیر نەفی سیفەتێکی خراپ دەکات لە وەصفکراو، ئەوەش بیر بۆ ئەوە دەبات وەصفی بکات، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەریدەخات چی دەکات و چۆن بیرو کردەوەیەکی هەیە، لە چاندنی میکرۆبی مەرگ و نارەحەتی، بەوە دەردەکەوێ مەبەستی لۆمەیە، بەڵام لە بەرگی وەصف پێشکەشی کردووە، نەك مەبەستی وەصف بێ.

ـ ملیۆنەهاین
بەڵام خاوەنی ملیۆنێ دڵ و ڕێگاین... شێرکۆ بێکەس.
جاری یەکەم شاعیر دەڵێت: ملیۆنەهاین، ئەمە وەصفە، بیر بۆ ئەوە دەچێت، شاعیر وەصف دەکات، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: (بەڵام خاوەنی ملیۆنێ دڵ و ڕێگاین)! بەوە دەردەکەوێ، مەبەستی وەصف نییە، بەڵکو ئەمە شێوازە و مەبەستی لۆمەیە، بەڵام لە بەرگی وەصف خستوویەتییەڕوو.

ـ ملیۆنەهاین
بەڵام هەموو هەر سەرکردە و قارەمان و زاناو ئازاین... شێرکۆ بێکەس.
جاری یەکەم شاعیر دەڵێت: ملیۆنەهاین، ئەمە وەصفە، بیر بۆ ئەوە دەچێت، شاعیر وەصف دەکات، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: (بەڵام هەموو هەر سەرکردە و قارەمان و زانا و ئازاین)! بەوە دەردەکەوێ، مەبەستی وەصف نییە، بەڵکو ئەمە شێوازە و تەوسە، مەبەستی لۆمەیە، بەڵام لە بەرگی وەصف خستوویەتییەڕوو.

ـ ملیۆنەهاین
بەڵام دووانمان بە یەك نەلکاین... شێرکۆ بێکەس.
جاری یەکەم شاعیر دەڵێت: ملیۆنەهاین، ئەمە وەصفە، بیر بۆ ئەوە دەچێت، شاعیر وەصف دەکات، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: (بەڵام دووانمان بە یەك نەلکاین)! بەوە دەردەکەوێ، مەبەستی وەصف نییە، بەڵکو ئەمە شێوازە و مەبەستی لۆمەیە، بەڵام لە بەرگی وەصف خستوویەتییەڕوو.

ـ ملیۆنەهاین
بەڵام وەك ئاردی ناو دڕکی بەر ڕەشەباین... شێرکۆ بێکەس.
جاری یەکەم شاعیر دەڵێت: ملیۆنەهاین، ئەمە وەصفە، بیر بۆ ئەوە دەچێت، شاعیر وەصف دەکات، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: (بەڵام وەك ئاردی ناو دڕکی بەر ڕەشەباین)! بەوە دەردەکەوێ، مەبەستی وەصف نییە، بەڵکو ئەمە شێوازەو مەبەستی لۆمەیە بەڵام لە بەرگی وەصف خستوویەتییە ڕوو.

ـ غەریبە چی لە دەست نایە
دەنا تۆزێ دەستی هەبێ
هێندە
بە جەرگ و ئازایە
زیندووان
وەك مردوو بنێژێ
لەلای نە باران، نە بایە! ... ئیدریس عەبدوڵڵا

لە دێڕی یەکەمدا (غەریبە چی لە دەست نایە)، بیر بۆ ئەوە دەچێ، شاعیر مەبەستی وەصف بێ، دوای ئەوەش دیسانەوە دەڵێ: (هێندە بە جەرگ و ئازایە)! ئەوەش وەصفێکی ترەو بیر بۆ ئەوە دەچێ مەبەستی شاعیر لەو پارچەیە هەمووی وەصف بێت، بەڵام کە درێژە بە گوتەکەی دەدات و تەواوی دەکات، دەڵێت: (زیندووان وەك مردوو بنێژێ، لەلای نە باران نە بایە)! بەوە روون دەبێتەوە، مەبەستی شاعیر لۆمەیە نەك وەصف، بەڵام لۆمەکەی لە بەرگی وەصف پێشکەشکردووە.

ـ دەڵێی گوڵە
بەڵام بێ بۆنە و
بێ جوانی
بێ سۆزە و
بێ میهرەبانی... ئیدریس عەبدوڵڵا

سەرەتا شاعیر وەها وەصفی بەرامبەر دەکات، کە بە گوڵ دەچێ، ئەوەش وەصفە، بەڵام کە قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: بێ بۆنە و بێ جوانییە و بێ سۆزە و بێ میهرەبانییە، هەموو ئەوە مەبەست دەردەخەن، کە (لۆمەی لە بەرگی وەصفە).

ـ بەڵێ بەڵێ!!
تۆشمان وەك کەو
لەلا جوان و دەنوك سوورە
ئەی ئەوە نییە

کردەوەکانیشت وەکو هی کەو جوانن
هەموو ساتێکی ریسوایی و
پەنا بە خوا خۆفرۆشییە و
لە رەوشتی مرۆڤ بەدوورە... ئیدریس عەبدوڵلا

سەرەتا بە وشەکانی جوان و دەنووك سووری وەکو کەو، بیری خوێنەر بۆ ئەوە دەبات ئـەوە وەصفی بەرامبەر دەکات، بەڵام کە وتارەکەی تەواو دەکات و دەڵێ، ئەدی ئەوە نییە وەکو کەو خۆفرۆشی و کردەوەکانت لە رەوشـتی مـرۆڤ بـەدوورە، لێـرە بـەدەر دەکـەوێ، لـە سـەرەتاوە مەبەستی لۆمە بووە، نەك وەصف، ئەوەش لۆمەی لە بەرگی وەصفە.

- هەویەی خەفیفەی هەر ماوە
نەوەك رۆژەك بەکەڵکی بێ
لەو بگرە و بەردە و کێشمەیە
خوا دەست بە باڵیەوە بگرێ و
چەپارەی دا
ئەزموونی کورد
بێ ئەو کەڵە رۆشنفکرە
هێوێن نابێ و دەڵەمەیە... ئازاد دلزار

شیعرەکە هەمووی وەکو ئەوە وایە وەصف بێ، بە وشـە و دەربڕینـی وەصـفی نووسـراوە، کەچی مەبەستی تەوس و لۆمەیە، بەوەش لۆمەی لە بەرگی وەصف دروستبووە.

- چی پاشایە
پاسەوانی تایبەتی خۆیان داناوە
چی دەرگایە
وا لەسەر پشت
بۆ کچی جوان و ژنی قشت... دیوانی لەتیف هەڵمەت

بوونی دەرگای بەرپرسان لەسەر پشت بۆ خەڵکی شتێکی باشە، بەڵام شاعیر دەڵێ ئەمەیان بۆ چەوساندنەوەی ئافرەت و کچانی میللەتە، نەك بۆ ڕێزلێنانیان، بەوە دەردەکەوێ مەبەست لۆمەیە و لە بەرگی وەصف پێشکەشکراوە، نەك مەبەست وەصف و پیاهەڵدان بێ.

**پۆشین:**

(پۆشین) لە عەرەبیدا (التوریه)ی پێدەڵێن.. بریتییە لە دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان دوو شت، یەکیان واتایەکی دووری هەبێ، ئەوی تریان واتایەکی نزیك، بەڵام لە دەقەکە مەبەست واتا دوورەکە بێ.. یان بەواتایەکی تر: پۆشین ئەوەیەشاعیر، یان نووسەر وشەیەك بێنێت، ئەو وشەیە دوو واتا بگەینێت، یەکی دوور و یەکی نزیك، ـ (کە دەڵێین دوور، مەبەست ئەوەیە پیاو درەنگ بۆی دەچێ نەختێ لێکدانەوەی پێدەوێ، بەڵام کە دەڵێین: مانایەکی نزیك، مەبەست ئەوەیە، کە گوێگر یان خوێنەر هەر زوو بۆی دەچێ و وەریدەگرێ) ـ جا مەرجە لە پۆشین، شاعیر، یان نووسەر مەبەستی بەم وشە جووت واتایە، واتا دوورەکە بێت.

بێگومان ئەم واتا دوورەش وەنەبێ لە خوێنەری زرنگ و هۆشیار ون و شاراوەبێ، بەڵکو هەر ئەوەندەیە، کە سەر لە خوێنەری کەمبین دەشێوێنێ و نەزاکەتێکی تەڕیش پەیدا دەکات.. بۆ وێنە:

**جۆرەکانی پۆشین:**

پۆشین وەکو یەك لە شێوازە جوانەکانی دەربڕین زیاتر لە جۆرێکی هەیە، لەوانە :

**یەکەم: پۆشینی ڕووت**

بریتییە لە بە تەنیا هاتنی ئەو وشەیەی کە (پۆشین)ەکەی لێدروست دەبێت، بەو شێوەیەی کە هیچ هێماو ئاماژەیەکی لە تەك نەهاتبێت، ئەوە بخاتە ڕوو مەبەست واتا نزیکەکە، یان دوورەکەیە.. بۆ نموونە:

ـ پیاوێکمان ئەمرێ تەعزێی بۆ دەگرین
بۆچ بۆ گەڵاوێژ نەگرین تا دەمرین... پیرەمێرد

لەم دێڕەدا وشەی (گەلاوێژ) دوو واتای هەیە، واتایەکی نزیك کە ئاشکرایە (ژنێکە بەو ناوەو مردووە)، کە خوێنەر هەر کە دێڕەکە دەبیسێت، مادام باسی مردنە و باسی تازیەی پیاوانە، بیری بۆ ئەوە دەچێت، ئەی بۆچ جیاوازی لە نێوان پیاو و ژن بکەین و بۆ، بۆ گەلاوێژیش هەمیشە تازیە بار نەبین؟! بەڵام (گەلاوێژ) واتایەکی پۆشراو و دووریشی هەیە، شاعیر مەبەستی ئەوە، کە ئەویش (گۆڤاری گەلاوێژ)ە، واتە ئەی بۆچی بۆ داخرانی (گەلاوێژ)ی گۆڤاریش کە ئەویش کەسایەتییەکی مەعنەوی هەیە، وەکو پیاو کەسایەتییەکی ماددیی هەیە، بۆ بۆ ئەویش تا مردن تازیەدار نەبین، خۆ لە پیاوێك کەمتر نییە!

لەم دێڕەدا ئەو وشەی (گەلاوێژ)ە، کە پۆشینەکەی دروستکردووە، هیچ نیشانەیەکی لەگەڵ نییە، کە مەبەست لێی واتا دوور یان نزیکەکەی بێت.

**دووەم: پۆشینی پالاّو**

بریتییە لەو پۆشینەی، کە لە تەك ئەو وشەیەی کە پۆشینەکەی لێ دروست دەبێت، وشەیەکی تر هاتبێت، وای دەربخات، کە هێمایە بۆ واتا نزیکەکە، ئەمەشیان هەر بۆ ئەوەیە، تا زیاتر بیر و هۆشی گوێگر بۆ لای مانا نزیکە نامەبەستەکە بچێت و زەین و هۆشی لە مانا دوورە مەبەستەکە دوور بکەوێتەوە.. بۆ نموونە:

ـ (ئیبراهیم) لە ناو (نار)دا سووتاوە

سەجادەی تەقوا بێ رایەڵ ماوە... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەم باس لە (ئیبراهیم) کراوە، کە وشەیەکە پۆشینەکەی دروستکردووە، وشەی (نار)یشی بە دوادا هێنراوە، تا زیاتر خوێنەر بۆ مانا نزیکەکە ببات و لە مانا دوورە مەبەستەکەی دووربخاتەوە، کە مانا نزیکەکەش ئەو باسەی لە ئاگر خستنی حەزرەتی (ئیبراهیم) پێغەمبەرە (درود و سڵاوی خوای لەسەر) کە کاتێك درۆکانی (نەمرود)ی ئاشکراکرد و لە پێش چاوی راوێژکار و وەزیر و میللەتەکەی بۆی روونکردەوە ئەو بە تەنیا مرۆڤێکە و دەسەڵاتی دیاریکراوە، ناتوانێت ژیان و مەرگ بە کەس ببەخشێت، چونکە ئەوە ئیشی خوایە، نەك هی بەندە، (نەمرود)یش لێی توڕەبوو و بڕیاری ئەوەی دا بیخەنە ناو ئاگر، بەڵام خوای گەورە لەبەر هەڵوێستی زۆر جوانی ئەو پێغەمبەرە لە ئاگری رزگارکرد و بە ئاگرەکەی فەرموو (یا نار کونی بردا وسلاما علی ابراهیم).. واتە: ئەی ئاگر ساردبە و سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم.. ئەو رووداوەش قورئانی پیرۆز تۆماری کردووە، بۆیە کە شاعیر

ئەو وشانەی (ئیبراهیم) و (نار) بەکاردێنێت، یەکسەر خوێنەر بیری بۆ ئەو مانا نزیکە دەڕوات، بەڵام لە راستیدا ئەو مانایەشی مەبەست نییە، بەڵکو مەبەستی لە (ئیبراهیم) سەرنووسەری گۆڤاری (گەلاوێژ)ە، کە (ئیبراهیم ئەحمەد)ە، لە وشەی (نار)یش مەبەستی ئاگری ئازاری داخستنی گۆڤارەکەیەتی، کە پێوەی دەسووتێت، بەم شێوەیەش (پۆشینی پاڵاو)ی جوان و سەرنجڕاکێش دروست بووە.

لە نیوە دێڕی دووەمیشدا ئاماژەی بە (سەجادە) کردووە، کە مانا نزیکەکەی (بەڕماڵی نوێژ و خواپەرستییە)، بە وشەی (تەقوا)ش زیاتر زەینی خوێنەری هەر بۆ ئەو مانا نزیکە راکێشاوەو دووری خستۆتەوە لەوەی بەلای مانا دوورەکەی دێڕەکە بچێت، کە مەبەست لێی (عەلائەدین سەجادی)ی نووسەری دووەمی ئەو گۆڤارەی (گەلاوێژ)ە، لێرەشدا دیسانەوە (پۆشینی پاڵاو)ی دروست کردووە.

## ڕێبازی گوتەیی:

لە عەرەبیدا (**المذهب الكلامي**)ی پێدەگوترێت.. لەلای (ئیبنول موعتەز) بە هونەری پێنجەمی (جوانکاری) دانراوە، (ئیبن و رەشیق) لە بەشی دووەمی کتێبەکەی خۆیدا (العمدە) دەڵێت: رێبازێکی گوتەیی فەلسەفییە، (زەرکەشی)ش دەڵێت: بریتییە لە پاساوهێنانەوە بۆ واتای مەبەست، بە پاساوێکی ئەقڵی وەها هیچ لاملێییکردنێك بۆ خۆی نەهێڵێتەوە، واتە بەڵگە ئەقڵییەکە بڕوا بە بەرامبەر بێنێت و رایەکی دیکەی بۆ نەهێڵێتەوە.

لەبەر رۆشنایی ئەم رایانەش دەتوانین بڵێین: بریتییە لەوەی شاعیر، یان نووسەر لەسەر شێوازی کەلامییەکاندا بەرگری لەو بیرەی خۆی بکات، کە پێشکەشی دەکات و بەرگریکردنەکەیشی لە بیرەکەی خۆی بە بەڵگەی ئەقڵی وەهابێت، بەرانبەر چ بیانوویەکی بۆ نەمێنێتەوەو یەکسەر بڕوای پێبکات. بۆ نموونە:

- چاوم هەڵبڕی ئاسمانم دی  
گوتم: بێ وەستا نەهاتۆتە دی  
ئەگەر کردەوەی بێگانە بووایە  
خۆ ئەشیا بێ ستوون رانەوەستایە  
دیارە هەر چەرخێك پیاو دروستی کا  
کاتێکت زانی سوواو تێك شکا... پیرەمێرد

شاعیر لێرەدا باس لەوە دەکات، کە ئەم ئاسمانە بێ خاوەن خەڵقنەبووەو ئـەوەی خەڵقیشـی کردووە زۆر ئەفرایندەو بەدیهێنەرێکی گەورە و بە توانا بووە، چـونکە راگرتنـی ئـەو ئاسمانـە گەورە و فراوانە بەبێ ستوون، ئەمە کارێکی ئەقڵ قەبوڵی ناکات هیچ مرۆڤێك هەبێت لەسەر پشتی ئەو زەوییە پێی بکرێت، تەنانەت ئەو کارانەیش کە ئادەمیزاد دەیانکـات، بـە زوویـی تێکدەچن، بەڵام کە ئەو کارەی خوا هەزارەها ساڵە بـەو تەواوییـە وەکـو خـۆی مـاوە، ئـەوە بەڵگەیەکی ترە لەسەر خالقیەت و تواناداری خـوا لـەو بـارە.. واتـە: ئـەو کـارەی راگرتنـی ئاسمانەکان بێ هیچ کۆڵەگە و ستوونێك، کارێکە هەر لە خوای تەنیا دەوەشێتەوە، لەبەر ئەوەی خاوەنی سیفاتی (قودرەت و کەماڵ)ەو لە هەموو شتێکدا تەواوە.

ـ ئەبێ بەخشندە مل کەچکا لە راستی مووچەخۆری خۆی
سوراحی سەر فرودێنێ لە بۆ پیاڵە، کە تێێ کا بۆی... پیرەمێرد

شاعیر ئەم شیعرەی بۆ (شێخ مەحموود) ناردووە دوای ئەوەی شێخ چەند مانگێـك لەسـەر شیعرێکی تری لێێ توورەبووەو نەیهێشتووە بگاتە لای، (پیرەمێرد))یش ئەوەی بەلاوە قـورس بووە، هاتووە بەو شیعرەی دڵی چاککردۆتەوە، بە بەڵگەی ئەقڵی تێی گەیاندووە، کە بـۆ ئـەو گونجا و نییە لە کەس توورەبێت، بەڵکو دەبێت خـاوەنی لێبـووردن بێـت لەگـەڵ هاووڵاتیـانی خۆی.. بۆیە لەو دێڕەی سەروو نووسـیویەتی: کەسـی گـەورە دەبێـت لەگـەڵ بچـووکی خـۆی لێبووردە بێت، چاوپۆشیکەربێت، هەمیشە کۆمەکی بکات، نەك پەڵپی لێبگرێت و حسێب بۆ هەڵەکانی بکات. بەڵگە ئەقڵییەکەیشی ئەوەیە، کە دەڵێت: ئەدی ئەوە نییـە سـوراحی بـەو گەورەییەی خۆی بۆ بەرداخێکی بچووك مل شۆڕدەکاتەوە تا پێی ببەخشـێت و لێیشـی بێـزار نابێت؟!

دوای ئەوە درێژە بەو بیرەی دەدات و دەڵێت:

ـ کە ئاو داری لەسەر گرتووە ئەیزانی چی تیایە
لە لای نەنگە کە پەروەردەی نقوم کا گەورەیی وایە... پیرەمێرد

ئەوەتا ئاوی دەریایەك چەندەی گەورەیە بەلاوەی نەنگە دارێکی بچووك لەسەر پشتی خۆی وەلانێ و نقومی بکات، دەی گەورەیی وایە، ئەی تۆ چۆن دەبێ توورە بیت؟!

شاعیر بەردەوام دەبیت لەسەر بەڵگە ئەقڵییەکانی وەکو چۆن کەلامییەکان وەها پاساو بۆ راکانی خۆیان دێننەوەو بە شێخ دەڵێت:

ـ لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار
پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لەقەش بۆ سەر پەلی بەردار... پیرەمێرد

لقە شۆڕەکانی درەخت خەڵك پێویستیان بەوە نییە دار و بەردی تێبگرن، هەر خۆیان دەستیان پێی دەگات و بەرووبوومەکەی دەخۆن، بەڵام پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە و لەقەش بۆ سەر ئەو پەلانەیە، کە بەردارن و بەرزن، دەستی خەڵکی ئاسایی پێیان ناگات، ئەدی چییان لێبکات؟! واتە شاعیر دەڵێت: تۆ پەلێکی بەرزی، خۆ پەلێکی نزم و ئاسایی نیت، بەرزەوەندی خەڵکیت لەلایە، ئەی چۆن خەڵك بۆ زامنکردنی ئەو بەرژەوەندییانەیان بەر پلار و شتی دیکەت نادات؟!

لە دێڕێکی تر شاعیر رووی ئامۆژگاری دەکاتە یەك لە دۆستانی و پێی دەڵێت:

ـ دوو گوێ و زوبانێك دراوە بە تۆ
دوو ببیە و یەکێك بڵێ لەسەر خۆ... پیرەمێرد

واتە بۆیە دوو گوێ و یەك زوبانت پێدراوە، بۆ ئەوەی دوو قسە ببیسی و یەك قسە بکەیت، ئەدی نابینی خودا وەهای خەڵقکردووی؟! ئەدی کەوابێت بۆ وەها نەکەیت؟!

(دلزار)یش نموونەی جوانی هەیە، لەوانە:

ـ ئەگەر جوامێری و پەسندە کارت
خۆت هەڵنەکێشی بە کەس و کارت
ئیبراهیم خەلیل رەسوولی چاك بوو
بەڵام باوکەکەی نیهاد ناپاك بوو!
کوڕی نوح بە قسەی باوکی خۆی نەکرد
نوقمی تۆفان بوو، بە بێکەسی مرد...دلزار

بەڵگەکە ئەقڵییەکە کەس نابێ خۆی بە کەس و کاری خۆی هەڵکێشێ، چونکە ئەگەر پێشەوایەکی وەکو حەزرەتی ئیبراهیم (درود و سلاوی خوای لەسەر) نەیتوانی بێ سوودێك بە باوکی بگەینێ، ئیدی کێی تر دەتوانێ سوود بە تۆ بگەینێ؟!

ئەم بەڵگانەی هەموو ئەو دێڕانەش، بەڵگەی ئـەقڵی شـاعیرن، بەرانبـەر دەخەنـە ئـەمری واقیع، ناتوانێت ملکەچییان نەکات.

ـ تۆ بۆ پیاوی؟
گەر هەموو جار لێم نەبووری؟!...عوسمان مستەفا خۆشناو

لێرەدا شاعیر بەرامبەرەکەی بەوە دەبەستێتەوە، کە ئەگەر پیاوبێ دەبـێ هـەموو جارێـك لێی ببووری، دەنا بە پیاو نازانرێ، بەڵگەکە، بەڵگەیەکی ئەقڵییە و بەرامبـەر رازی دەکـات، ئەوەش رێبازی گوتەییە.

## جێگۆڕین:

لە عەرەبیدا (العکس) و (القلب)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی دەربـڕین، لـە سـنووری وشەی لێکدراودا بێ یان رستە بێ، چ لە سەرەتاوە تا کۆتـایی وشـەکانی بخوێنرێتـەوە، چ لـە کۆتایی بۆ سەرەتا وشەکانی بخوێنرێتەوە هەر هەمان شت دەربچێت، بۆ نموونە:

ـ بگرین هەموو
وەکو چاوی بن تووی مەلیك
لە بناری ئەم دیو گۆیژە
هەموو بگرین... ئەژی گۆران

(بگرین هەموو) کە لە سەرەتای ئەم کۆپلە هاتووە، دواتر لـە کۆتـایی کۆپلەکـە کراوەتـە (هەموو بگرین)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

ـ تا کەنگێ مێروولەی لەشت
باری قورسی سەرت لەسەر شان دابنێ و
لە ئاوارەیی بۆ زیندان
لە زیندان بۆ ئاوارەیی
بتلێتەوە... مارف ئاغایی

(لە ئاوارەیی بۆ زیندان) جێگۆڕین بە وشەکانی کراوەو لە جـاری دووەمـدا کراوەتـە: (لـە زیندان بۆ ئاوارەیی).. بەوەش بەردەوامییەکی داوەتە جووڵە و واتای فراوانتر کردووە.

ـ عەشق و جوانی لەسەر من و تۆدا کەوتە روو

من بەختی تۆم خەوم نییە، تۆش بەختی من بنوو... پیرەمێرد

لەم دێرەدا لە نیوە دێری دووەم سەرەتا (من بەختی تۆم) هاتووە، لە پاشان شاعیر جێگۆڕکێی بە وشەکانی ئەو رستەیەی کردووە و گوتوویەتی: (تۆ بە ختی من)ی، کە هەردوو رستە ئەگەر یەکەمیان لە سەرەتاوە بخوێنیەوەو دووەمیان لە کۆتاییەوە هەر یەك شت دەردەچن، یانیش ئەگەر دووەم لە سەرەتاو یەکەم لە کۆتایی بخوێنیەوە دیسانەوە هەر یەك شت دەردەچن، بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروستکردووە.

ـ هەندێك ئابڕووی لەلا شیرینە

ژین ئابڕووە، ئابڕوو ژینە... شارباژێری

لە نیوە دێری دووەمدا (ژین ئابڕووە) کە لە دوو وشەی (ژین) و (ئابڕو) پێکهاتووە هەردووکیان ناوی واتایین، لەبەشی دووەمی نیوە دێرەکەدا شاعیر هەڵیگەڕاندوونەتەوە، جێگۆڕکێی بە شوێنەکانیان کردووە، ئەمجارەیان کردوویەتییە (ئابڕوو ژینە) ئەوەش(جێگۆڕین)ە.

ـ گوڵی سوور، سوور گوڵی باغی حەیاتم

لە دووری تۆیە وا کەسر و کەساسم... ئیدریس عەبدوڵڵا

(گوڵی سوور) پێکهاتووە لە (گوڵ) کە (ناو)ە، لەگەڵ (سوور)، کە (ئاوەڵناو)ە.. لە جاری دووەمدا جێگۆڕکێ بەدوو وشەکانی کراوەو، بووە بە (سوور گوڵ).

ـ لەو رۆژانەوە دێم کە تیایدا

خاك من بووم و

من خاك... عومەر سەیدە

(خاك من بووم) جێگۆڕین بە وشەکانی کراوەو لە جاری دووەمدا کراوەتە: (من خاك).. بەوەش بەردەوامییەکی داوەتە جووڵە و واتای فراوانتر کردووە.

ـ خەریبم ئەز

ئەز خەریبم ژ لاوێ دەلال... سعاد سلێڤانەیی

(خەریبم ئەز) جێگۆڕین بە وشەکانی کراوەو لە جاری دووەمدا کراوەتە: (ئەز خەریبم).. بەوەش بەردەوامییەکی داوەتە جوولەو واتای فراوانتر کردووە.

- بلوورا من
دەنگێ خوە بەردە
دنیا
مینا زارۆکەکێ بەرشیر
کەت دەر گووشا خوە
دەنگێ خوە بەردە بلوورا من... جەلادەت بەدرخان

(بلوورا من دەنگێ خوە بەردە) لە سەرەتای پارچەکە هاتووە، دواتر لە کۆتایی پارچەکە، بەم شێوەیە هێنایتیەوە (دەنگێ خوە بەردە بلوورا من)..

لێرەدا شاعیر هاتووە پاشەوپێشی کردۆتەوە، واتە جێی دوو لەتەکانی گۆڕیوەو لەتی یەکەمی سەرەتای لەوەی کۆتایی کردۆتە لەتی کۆتایی و لەتی دووەمی سەرەتای لەوەی دواییدا کردۆتە لەتی یەکەم، بەوەش (جێگۆڕین)ێکی جوانی دروستکردووە.

## ئەو گاڵتەیەی مەبەست لێی راستییە:

(ئەوگاڵتەیەی مەبەست لێی راستییە) لە عەرەبیدا (**الهذل الذي يراد به الجد**)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە دارشتنی دێرێك، یان چەند دێرێکی هۆنراوە، لە بەرگی گاڵتە و گەپدا، بەڵام لە ناواخندا مەبەست راستی بێ، نەك گاڵتە.. بۆ وێنە:

- من راگەینراوێکم دی لێی نووسرابوو:

ئێمە کۆمەڵێك ڕووناکبیر، بڕیارمان دا حزبێکی نوێ دامەزرێنین، بەڵام تا ئێستا نەکراوە، هیچ رەنگێ بدۆزینەوە، کە پێش ئێمە حزبێك نەیکردبێ بە ئاڵا، داوا لە خەڵکی کورد دەکەین، ئەگەر کەسێ رەنگێکی تازەی پێ شك دێ، پێوەندیمان پێوە بگرێ!

ڕەش رەش رەش رەش
ئەوە رەنگێکی لەبیرچووی ئاڵایەکی هەڵنەدراوە
سوور سوور سوور سوور
ئەوە چۆمێکی نەسرەوتووی

لە کێوی لەش هەڵبڕاوە... مارف ئاغایی

کە ئەم شیعرە دەخوێنینەوە، وا هەست دەکەین، شاعیر بە جددی قسە بکات، بەڵام کە دەگەینە کۆتایی، هەست دەکەین، مەبەستی گاڵتە کردنە بە باسکراو، نەك بە راستی ئەو قسانەی کردبێ، مەبەستی ئەوەیە ئەوەندە حزب هەیە، خۆ رەنگیان تەواوکردووە!!

ـ ئەو کەرەی کە وا خۆی سواری بووە
چونکە نایبینێ، لەبیری چووە!
وتی: دابەزە، هەی بەندەی بێ غەش
پێنجی بۆ ژمارد، خۆیشی کرد بە شەش... پیرەمێرد

ئەم شیعرەی (پیرەمێرد)، کە خۆی لە ژێر ناونیشانی (گاڵتەی بە راست) هۆنیویەتییەوە، لە دوا دێڕدا کە دەڵێت: پێی گوتووە ئەوە پێنج کەر و شەشەمیش تۆی، قسەکەر ئەمەی وەکو گاڵتە و سوحبەت خستۆتەڕوو، بەڵام لە راستیدا بە راستیشی بووە، بەمەش ئەو گاڵتەی مەبەست لێی راستییە بەرهەم هاتووە.

**تێلنیشان:**

تێلنیشان لە عەرەبیدا (تلمیح)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە ئاماژەدانی شاعیر، بە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەیەك، یان پەندێکی پێشینان و رووداوێکی مێژوویی گرنگ، یان داستان و بەسەرهات و هەر شتێکی تری هاوشێوە، بەڵام بێ ئەوەی کە ئاماژە بۆ شتێ دەکات، لەسەری بوەستێ و بە درێژی باسی بکات، بەڵکو هەر بە ئاماژەیەکی خێرا بەسەریاندا تێدەپەڕێت.. بۆ وێنە:

ـ هەنگوین بە وشەی یەزدان
دەرمانە بۆ گشت دەردان... بێخەو

(وشەی یەزدان) کە لە نیوە دێڕی یەکەمدا هاتووە، (تێلنیشان)ە، بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، کە ئایەتی (٦٩)ی سوڕەتی (النحل)ەو، تیایدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يخرج من بطونها شراب مختلف ألوانه فيه شفاء للناس أن في ذلك لأية لقوم يتفكرون﴾.

**جۆرەکانی تێڵنیشان:**

١- تێڵنیشان بۆ ئایەتی قورئانی پیرۆز: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێڵنیشان بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەکرێ.. بۆ نموونە:

ـ ئەگەر هەبێت
ڕێگایەکی سەرفرازی
ئەگەر هەبێت
هیوا و ئومێدێك بۆ سبەی
ئەوە تەنها
لە پەیامە ژینبەخشەکەی
تۆی مامۆستا و پێشەنگ دایە
کە سەراپای هەر ڕەحمەتە و
بەخششی گەورەی خودایە... جەلالەدین نەجمەدین

(سەراپای هەر ڕەحمەتە) تێڵنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ ٱلظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً﴾. سوڕەتی پیرۆزی (الإسراء)، ئایەتی: ٨٢.

ـ بەڵێ: محەمەد پەیامبەر
ئەی ترسێنەر و موژدەدەر... خدر کۆساری، بوڕکانی شیعر، هەولێر، ١٤١٨هی، ١٩٩٨ز، لا ١٠.

نیوە دێڕی دووەم، تێڵنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾.. سوڕەتی پیرۆزی (سبا)، ئایەتی: ٢٨.

ـ ئای کە ناوی شیرینە
ڕەحمەت لیلعالەمینە... جەمال بێدار

تێڵنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ سوڕەتی پیرۆزی (الانبياء).. ئایەتی: ١٠٧.

ـ بەبە گیان ئەتۆ جوانی
ڕێزلێگیراوی یەزدانی... خدر کۆساری

نیوه دێڕی دووەم تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِّنَ ٱلطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ سورەتی پیرۆزی (الإسراء)، ئایەتی: ٧٠.

٢ـ تێلنیشان بۆ فەرمووده: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەکرێت (درود و سڵاوی خوای لەسەر).. بۆ نموونە:

ـ بێن جیهادی گەورە کەین

لە دژی هەوەس سەورە کەین... جەمال بێدار

جیهادی گەورە تێڵنیشانە بۆ ئەو فەرموودەیەی، کە جیهادی نەفس و دەروون بە جیهادە گەورەکە و گەورەتر لە قیتال دادەنێت. وەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((قدمتم خير مقدم وقدمتم من الجهاد الآصغر الى الجهاد الأكبر مجاهدة العبد هواه)) لە کتێبی: (کنز العمال)ی (علي بن حسام الدين المتقي الهندي)دا هاتووە.

ـ دوو چاو ئاگریان ناگاتێ

ڕەوا بینن هەموو ساتێ

لە نێو سەنگەر ئێشکگرن

تاو نا تاوەش دیدان دەوڵن... خدر کۆساری

تێلنیشانە بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەکرێت (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، کە دەفەرمووێت: ((عينان لم تمسهما النار، عين بكت من خشية الله، وعين باتت تحرس في سبيل الله)).

ـ لەسەر قەبرەکان داری ئەرخەوان

وەك بوکی تارا سووری ئاودامان

ڕوو لە عەرشی پاك ئەلەرایەوە

بۆ گیانی مردوو ئەپاڕایەوە... گۆران

تێلنیشانە بۆ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، کە لە (بوخاری) هاتووە و پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) دەچێ لەسەر دوو گۆڕی خاوەن ئازار، بە

هۆی گوناهەوە، کە گوناهەکانیشیان گەورە نییە، درەخت دەچێنێ و سەحابەکانی وەها فێر دەکات، کە بەڵکو بەم هۆیەوە ئازاریان لەسەر کەم بێ، ((لعله أن يخفف عنهما...)) واتە: بەڵکو ئازارەکانیان لەسەر سووك بکات. هۆیەکەش دیارە ئەوەیە تا دارەکان سەوز بن تەسبیحات دەکەن و بەم هۆیەوە دەشێ سوود بە مردووەکانیش بگات.

ـ چەندین (بوجەهل) و (ئومەییە)ی
عەرەب زمانی هەقنەناس
دەکەیتە پەندی زەمانە
کەچی (سەلمان)ی پیرە فارس
ئاوارەی دوور
کۆیلەو نەدار هیچ کەس نەناس
کردتە (سەلمانی خۆمانە) ... جەلالەدین نەجمەدین

(سەلمانی خۆمانە) تێلنیشانە بۆ ئەو فەرموودەیەی (پێغەمبەر)ی خۆشەویست (درود و سلاوی خوای لەسەر)، کە لە بارەی (سەلمانی فارسی)یەوە فەرمووی: ((سلمان منا اهل البيت)) المستدرك للحاكم النيسابوري، رقم الحديث: ٦٥٣٩.

بەمەش تێلنیشان بۆ فەرموودە دروست بووە.

٣- تێلنیشان بۆ رووداوی ئایینی: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ رووداوە ئایینییەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ موعجیزەت دوایی نایە
میعراج و کتێبی خوایە
بۆت دوو لەتبوونی مانگە
چەندی دی بەو پێو دانگە... مەلا عەبدی

(میعراج) و (دوولەتبوونی مانگ) دوو موعجیزەی گەورەی پێغەمبەرن (درود و سلاوی خوای لەسەر)، دوو رووداوی ئایینی گەورەن.

٤- تێلنیشان بۆ ڕووداوە مێژووییەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ ڕووداوە مێژووییەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ سەدەها پاشای مفتەخۆر
لە تاو تەخت وە زگ دێنن
فیرعەونی ئیر و پایەدار
لە زێی میسر دەخنکێنن... خدر کۆساری

تێلنیشانە بۆ ڕووداوی نغرۆبوونی فیرعەون، کە بڕوای نەهێنا، خۆی و سوپاکەی سەریان لە دو حەزرەتی موساو ئیماندارەکان هێنا (سەلامی خوای لەسەر)، بەڵام سەرەنجام بە غەزەبی خودا خۆی تێچوو و حەزرەتی موسا و ئیمانداران سەلامەت دەرچوون.

ـ یەکبوونە مایەی ئازادی و شادی
یەکبوونە چارەی چوار زامی کوردان... بێخەو

(چوار زامی کوردان) کە لە نیوە دێڕی دووەمدا هاتووە، (تێلنیشان)ە بۆ (چوار پارچەکەی کوردستان) کە هەر لەو ڕۆژەوەی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، کورستان بە ناڕەوا بۆ چوار پارچە دابەشکراوە، هەر پارچەیەی لەبەر ئەو ستەم و زۆرەی لە خەڵکەکەی دەکرێت، زامێکە و ئازاری کورد دەدات.

ـ دەی سا جەنەڕاڵ غۆڕۆی گەڕۆڵ
قاچی چەپەڵی تاوانت
لەسەر گڵکۆی ئەییوبی دلێر لابەرە
بڕۆ فریای بووڕکانی سەرپۆشبەسەری پاریس کەوە... جەلالەدین نەجمەدین

دێڕەکانی دووەم و سێیەم:

(قاچی چەپەڵی تاوانت

لەسەر گڵکۆی ئەییوبی دلێر لابەرە).. ئەمە تێلنیشانە بۆ ئەو کردەوەیەی، کە (جەنەڕاڵ غۆڕۆ)ی فەرەنسی دوای شەڕی یەکەمی جیهان و داگیرکردنی شام، کە دەچێتە سەر گۆڕەکەی سەرکردەی کوردی جیهانی ئیسلامی (سەلاحەدینی ئەیوبی)، قاچی پێدادەکێشێ و دەڵێت:

(ئەی سەلاحەدین ئەوە هاتینەوە).. واتە: ئێمەی رۆژئاوای خاچپەرستانی دوێنێ ئەمجارەشیان هاتینەوەو بەسەرتاندا سەرکەوتینەوە، ئەوەش (تێلنیشانە بۆ رووداوێکی مێژوویی).

٥ـ تێلنیشان بۆ پەندی پێشینان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ پەندێکی پێشینان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ ژیان تەنیا
چرکەی ئێستای خۆی دەبینێ
گەلێ جاریش گومان لە بەیانی ئەکا... بێلاف

دوو دێڕەکەی یەکەم تێلنیشانن بۆ پەندی پێشینانی (هەمبوو هەمبوو پارەی ناکا، هەیتم هەیتم هەوە)!

ـ ژنی بەد ژان و ژەنگی ژیانە
گەر خۆتی لێ دەی ماڵـ وێرانە...دڵزار
تێلنیشانە بۆ پەندێکی پێشینان، کە دەڵێ
ژنی بەد چەشنی کوڵنج ژان ئەهێنێ
ئەگەر زوو نەیتەقێنی، ئەتتەقێنێ

ـ بەڵام لاوێـی هەرگیزاو هەرگیز ناگەڕێتەوە
بەردیش کە بخزێ تازە شوێنی خۆی ناگرێتەوە...دڵزار
نیوە دێڕی دووە، تێڵنیشانە بۆ پەندی پێشینانی (بەرد لە جێی خۆی سەنگینە).

٦ـ تێلنیشان بۆ ئەفسانە و سەربردە فۆلکلۆرییەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ ئەفسانە، یان سەربردەیەکی فۆلکلۆری دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ ئەو سەردەمە، داری بەڕوو
لەژێرەوە رەگی قووڵی
لەسەر پشتی (گاوماسی)یەکە
داکووتی بوو... شێرکۆ بێکەس

(گاوماسی)یەکە، تێڵنیشانە بۆ ئەو ئەفسانەیەی دەڵێ: زەوی لەسەر پشتی گا و گا لەسەر ئاو و ئاو لەسەر پشتی ماسی و...هتد راوەستاوە.

ـ هەموو کەس نانی خۆش دەوێ
بەڵام گاوان
لەسەر سینگی خۆی دادەنێ
چونکە بەخۆی باش دەزانێ
بە چ جۆرێ دەست دەکەوێ... جەمال گردەسۆری

تێلنیشان بە واتا بۆ سەربردەی فۆلکلۆری، کە ئادەمیزاد رێز لەو شتە دەگرێت، کە ئارەقی پێوەکردووە، نەك بەو شتەی بە بەلاش بە دەستی کەوتووە.

ـ ئیتر هەر لە شەوێکا
لە تۆزە سەرخەوێکا
(تەڕوادە)ی نازدار و جوان
بوو بە ئەفسانەی نەمان... **محەمەد حسێن بەرزنجی**

تێڵنیشانە بۆ ئەفسانەی ئەسپی تەڕوادە، ئەفسانەیەکی یۆنانییە، لەم ئەفسانەیەدا هاتووە: ئەسپێکی ئەفسانەییە، ئەبیوس لە دار دروستیکرد و کۆمەڵێك پاڵەوانی شەڕکەری گریك بە فەرماندەیی ئۆدیسیۆس لە ماوەی شەڕی تەڕوادەی بەناوبانگ، خۆیان تیادا شاردەوە، بەم هۆیە شەڕەکە یەکلابوویەوە و گریك بەسەر تەڕوادەدا سەرکەوتن و شارەکەیان داگیر کرد، چونکە دوای تەواوبوونی ئەو ئەسپە، گریك وایان پیشان دا، کە وازدێنن و سواری کەشتییەکانیان دەبن و دەگەڕێنەوە، تەڕوادەییەکانیش بەوە دڵخۆشبوون و هاتن تەماشای ئەو ئەسپە بکەن، کە بە لایانەوە زۆر بە سەیری دروستکرابوو، (سینون)ی جاسووسی گریك لێیان نزیك بووەوەو پێی گوتن: دە وەرن ئەم ئەسپە بۆ خۆتان ببەن و بیبەنە ناو شارەکەتان، ئەم ئەسپە هێزێکی ئەفسووناویی هەیە، بە هۆیەوەی لە دوژمنە گریکەکانتان دەتانپارێزێت. تەڕوادییەکانیش بەو قسەیە بەهەڵچوون و ئەسپەکەیان بردە ناو شارەکەی خۆیان. کە شەو داهات، (سینون) هات پاڵەوانە گریکەکانی لە ناو زکی ئەسپە دارینە دەرهێناو ئەمانە رایان کرد، دەرگاکانی تەڕوادەیان کردەوە بۆ ئەو سوپایەیان، کە بە نهێنییەوە هاتبوونەوەو لە دەرەوەی تەڕوادە چاوەڕوانیان بوون، بەمە سوپای گریك هاتە ناو ئەم شارە و داگیری کرد.

٧- تێلنیشان بۆ کێشە سیاسییەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ کێشە سیاسییەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ بۆ کوێ بگریم؟
بۆ مزگەوتەکەی بابری؟
یان بۆ کێشەی گەلی کشمیر؟
یان بۆ بۆسنە؟ یان بۆ چیچان؟
کە هەر کامیان داستانێکن
پڕ مەرگەسات
پڕ لە تاوان... جەلالەدین نەجمەدین

مزگەوتی بابری و کێشەی کشمیر و بۆسنە و چیچان هەریەکە و چیرۆکێکیان هەیە، بە کورتی شاعیر بەو وشانە تێلنیشانیان بۆ دەکات.

٨- تێلنیشان بۆ کردەوەو دابی موسڵمانان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ کێشە سیاسییەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ ئیتر ئەبێ کونجێ بگرم دۆش دابمێنم
لەسەر مەرگی عومری جوانیم یاسین بخوێنم... گۆران

(یاسین خوێندن) تێلنیشانە بۆ کردەوەیەکی نەتەوە موسڵمانەکان بە گشتی و کورد بە تایبەتی، کە لەسەرەمەرگی ئازیزانیاندا سورەتی پیرۆزی (یس) دەخوێنن.. لێرەدا ئەم یاسین خوێندنە وەکو ئیدیۆم هاتووەو واتە: عومری جوانیم کۆتایی پێدێ، چونکە یاسین بۆ مردوو دەخوێنرێ.

٩- تێلنیشان بۆ کارەساتەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ کارەساتەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ هەر منداڵێ لە کوردستان
چاوی کردەوەو هاتە گۆ
...
دووەم وشەی

چوارچرایه... جەمال گردەسۆری

(چوار چرا) تێلنیشانە بۆ کارەساتی شەهیدبوونی پێشەوا قازی محەمەد و هاوڕێیانی.

١٠- تێلنیشان بۆ رووداوە ناوخۆییەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ رووداوە ناوخۆییەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ لای مرۆڤ هیچ

لای باڵندەش ئابڕوومان چوو

کاتێك حاجیلەی میوانی پەنا قەڵای هەولێرمان کوشت... مارف ئاغایی

تێلنیشانە بۆ رووداوی کوژرانی حاجی لەق لەقەکەی سەر منارەی مزگەوتی خانەقای هەولێر کە لە شەڕی ناوەخۆی نەوەتەکان کوژرا.

١١- تێلنیشان بۆ بەرهەمە ئەدەبییەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ بەرهەمە ئەدەبییەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ کە صادق مرد

چاوی سەوزی (تاران)ی دایك

پڕبوو لە بۆرانی خوێنین

هەرچی (سەگی هار و خوێڕی) جادەکان بوو

بە ناوەختان دەچوونە پێستی مرۆڤ و دەیانلوراند... ئەنوەر قادر جاف

سەگی هار و خوێڕی تێلنیشانە بۆ چیرۆکێکی (صادقی هیدایەت)ە بە ناوی (سگ و لگرد...)

١٢ـ تێلنیشان بۆ رۆژنامەکان: لێرەدا بە وشە، یان واتا تێلنیشان بۆ رۆژنامەکان دەکرێت.. بۆ نموونە:

ـ پیری ژیر ئەی خاوەنی ژین و ژیان

ئەی یەکە دڵسۆزی خاکی نیشتیمان... بەختیار زێوەر

وشەکانی ژین و ژیان تێلنیشانن بۆ هەردوو رۆژنامەی (ژین) و (ژیان) کە پیرەمێردی شاعیر و رۆژنامەنووس لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە سلێمانی دەریکردن.

**جیاوازییەکانی نێوان (تێکهەڵکێش) و (تێلنیشان):**

١- لە (تێکهەڵکێش)دا، شاعیر ڕاستەوخۆ ئایەتێکی پیرۆزی قورئان، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، یان دێڕێك، یان نیوە دێڕی شاعیرێکی تر، یان پەندێکی پێشینان، یان هەر شتێکی تر وەك خۆی و بەبێ دەستکاری کردنیان وەردەگرێ، لەگەڵ هۆنراوەکەی خۆی (تێکهەڵکێش)یان دەکات، بەڵام لە (تێلنیشان)دا شاعیر بە وشەیەك، یان زۆر جار بە واتا ئاماژە بۆ ئەو ئایەت و فەرموودە و پەند و ڕووداوانە دەکات.. وەك لە نموونەکانی پێشوو ئاماژەمان بۆ کردن.

٢- لە (تێکهەڵکێش)دا، جاری واهەیە، شاعیر ئاماژە بەوەش دەکات، کە ئەم دەربڕینە ئایەتە، یان فەرموودەیە، یان هی شاعیر و کەسێکی ترە، یان ئەگەر هیچیش نەڵێت، ئەوا لە نووسیندا ئەو پارچەیەی بە نووسینەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە، جا لە شیعر بێ، یان لە پەخشان، لە نێو کەوانەی دەخات، بەڵام لە (تێلنیشان)دا شاعیر ئەم ئاماژە و کەوانانە بەکارناهێنێ، چونکە ڕاستەوخۆ هیچ شتێکی وەرنەگرتووە، ئەوە نەبێ بەخێرایی ئاماژەیەکی بۆ شتەکان کردووە.

٣- (تێکهەڵکێش) یەکێکە لە هونەرەکانی (جوانکاری وشەیی)، بەڵام (تێلنیشان) یەکێکە لە هونەرەکانی (جوانکاری واتایی).

**فرەواتایی:**

(فرەواتایی) بریتییە لە بەکارهێنانی وشە یان چەند وشەو دەستەواژەیەك، کە بەسەریەکەوە، زیاتر لە واتایەك ببەخشن.. بۆ وێنە:

ـ کێڵگە دەسترێ بۆ باران
چیا بۆ هەڵۆ
ڕووبار و چەم بۆ نەوەستان
خۆر بۆ ئاسۆ
ئاگرپەرست بۆ ئاتەشگە
با بۆ چرۆ
منیش بۆ تۆ
کوردستانم

منیش بۆ تۆ... عەبدوڵڵا پەشێو

(کوردستان) لێرەدا دەشێت بە یەك لەو مانایانەی خوارەوە بێت:

١ـ بە واتای کچێك کە شاعیر خۆشی دەوێت.

٢ـ بە واتای وڵاتی کوردستان، کە شاعیر تیایدا هاتۆتە دنیا.

بە بێجگەی شاعیریش بە کەس یەکلاناکرێتەوە، بەڵام خوێنەر زۆر ئاساییە بە هەر یەکە لەو واتایانە لەو وشەیە بگات، بەمەش (فرەواتایی)یەکی جوان بەرهەم هاتووە.

ـ لەو ساتەوەی

کە بڕوام هات

تۆی ئاوات و خەوو هەستم

هەر تەنیا تۆی

خۆشەویستم... جەمال گردەسۆری

باسکراو کە خۆشەویستە دیارنییە، دەشێ خودای گەورە و میهرەبان بێت، دەشێ پێغەمبەرەکەی بێت (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، دەشێ وڵاتەکەی بێت، یان نەتەوەکەی بێت، یان یارەکەی بێت، یان هەر شت و کەسایەتییەکی دیکەی ماددی، یان مەعنەوی بێت.

ـ رقم لێتە

چونکە کارت

کوژاندنەوەی چراکانە

تێکۆشانت

بۆ ریسوایی

خەڵکی باشی

هاو شار و هاونیشتمانە... ئیدریس عەبدوڵڵا

کەسی وەسفکراو بەوەی شاعیر رقی لێدەبێتەوە، دیار نییە، بۆیە فرەواتایی دروست دەبێت و دەشێ ئەو کەسە هەر یەکێك بێت، لە سەرروویانەوە دەشێ (شەیتان) بێت، یان دوژمنێك بێت، یان هۆکارێکی راگەیاندن بێت، یان هەر کەسایەتییەکی دیکەی ماددی، یان مەعنەوی بێت.

**بەهەڵەبردن:**

بریتییە لەو دەربڕینەی، کە سەرەتا لە مێشکی بەرامبەردا، واتایەك دروست دەکات، بەڵام کە قسەکەر قسەکانی تەواو دەکات، ئینجا بەرامبەرەکەی بۆی دەردەکەوێت، کە بە هەڵەچووە، ئەگینا مەبەست بە تەواوی پێچەوانەی ئەو واتایەیە، کە یەکەم جار بۆی دروستبووە.. بۆ نموونە:

- ورد

ورد

بەسەر تاڵی زەردی قژی لاواك و حەیرانی

مەم و زینی پەشۆکاوی ئێوارەما دێنە خوارێ... شێرکۆ بێکەس

شاعیر کە باس لە تاڵی زەردی قژ دەکات، بیری خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە باس لە کچێك دەکات، کەچی کە ناوە تەواوکەرەکە دێنێت، دەبینین باس لە قژی لاوك و حەیران دەکات، بەوەش خوێنەر بەهەڵەدەبات.

- لە کاتێکدا کە منداڵ بووم

دەستی چەپم حەزی ئەکرد

وەك دەستی منداڵی پۆشتەی

دراوسێمان

سەعاتێکی تیا بێ ئەویش

وڕکم ئەگرت

دایکم ناچار گازی ئەگرت

لە مەچەکم

بە جێگەی - دان -

سەعاتێکی بۆ ئەکردم

ئای کە دڵخۆشی ئەکردم... شێرکۆ بێکەس

لەم پارچەیەدا، کاتێك شاعیر دەڵێ: من وڕکم دەگرت و دایکیشم ناچار دەبوو، گازی دەگرت لە مەچەکم! سەرەتا بیری خوێنەر بۆ ئەوە دەچێ، دایکی لێی تووڕەبووبێ و بەم گازە ویستبێتی بێدەنگی بکات، بەڵام کە شیعرەکە دەگاتە کۆتایی، دەبینین مەبەستی شاعیر ئەوە

نییـە، وەکـو خوێنـەر تێیگەیشـتووە، بـەڵکو بـەم دەربڕینـەی پێشـووی، شـاعیر خوێنـەری بەهەڵەبردووە، دەنا مەبەستی شـاعیر ئەوەیـە، دایکـی بـە گـازی ددانـەکانی سـعاتێکی بـۆ دروستکردووە! کە ئەوەش دیمەنەکە دەکاتـە تابلۆیـەکی سـۆزجولێنی بـەهێز، چـوون دایکـی داماوی چاری هەژاری و نەدارییەکەیانی بەم هۆکارە سروشتییە هیچ تێچووە کردووە! ئـەوەش بەرجەستەکەری وێنەی ئازار و ژیانی سادەی هەژاران دەکێشێ.

ـ چەند دڵۆپێك بە گۆنامدا دەڕژێتە خوار
دڵۆپەی باران؟
نا بابە گیان
ئەوە یادی مەرگی تۆیە
ئەمنیشی خستۆتە گریان... مارف ئاغایی

لێرەدا، شاعیر وا بۆ باوکی باس دەکات، کە چەند دڵۆپێك بـە گۆنایـدا دەڕژێنـە خـوار.. بابیشی کە وشەی (دڵۆپ) دەبیسێ، لەبەرئەوەی ئەو وشەیە تایبەتە بە باران، یەکسەر بیری بۆ باران دەچێ، بۆیە پرسیاری لێدەکات: دڵۆپی باران؟ کەچی شاعیر دەڵێ: نا بابە نا! دڵۆپی ئـەو فرمێسکانەی بۆ یادی مەرگی تۆ دەیانوەرێنم!

**فێڵکردن:**

ئەمە لە بەهەڵەبردن مەبەستدارترە، شێوازەکەی بە جیا لە بەهەڵەبردنـە، لێـرەدا شـاعیر سەرەتا باسی شتێك دەکات، ئەو رستەی پێشکەشی دەکـات، خەبـەرێك پێشـکەش دەکـات، واتاکەی روون و ئاشکرایە، کەچی دوایی دەڵێ: من مەبەستم ئەوە نییـە، مەبەسـتم شـتێکی دیکەیە، کە لە راستیدا رستە هەواڵییەکەی پێشووی، ئەو واتا شاراوەی دووەمی نەدەشیا لـێ باربکرێ، بۆیە خوێنەر هەر بیریشی بۆ نەچووبوو، قەتیش نەدەشیا بیری بۆ بچێ، چونکە ئەمە نهێنی بووەو نە خوێنەر و نە هیچ کەسی دیکەیش بە نهێنی کەسی تر نـازانێ، لەبـەر ئەمـە ئەوە هەر بەهەڵەبردن نییە، بەڵکو ئەمە فێڵە، لە شیعری هاوچەرخدا زیاتر بە دیار دەکەوێ.. بۆ نموونە:

ـ رەشترین قولەی ئەفریقام
بۆچی بە من پێدەکەنی، خۆ رەنگم نا:

باسی بەختم دەکەم بەختم... مارف ئاغایی

لەم پارچەیەدا، کە بەشی یەکەمی شیعرەکە، کە رستەی یەکەمە، رستەیەکی هەواڵی ئاشکرایە، کە دەکەوێتە بەر گوێی خوێنەر، یان بەرامبەر، ئەو یەکسەر لە واتا تێدەگات، هەست دەکات، ئەم هەواڵە زۆر ورد و دروست نییە، بۆیە جۆرێك لە گاڵتەی پێدێت و پێدەکەنێ، کەچی شاعیر بەو پێکەنینەی بەرامبەرەکەی رازی نییە، پێی دەڵێت: بۆچی بە من پێدەکەنی؟! خۆ من باسی رەنگ و رووخسارم ناکەم، مەبەستم بەختمە بەختم!! لە راستیشدا ئەمە فێڵکردنە و راگۆڕینە، دەنا رستەکەی یەکەم، ئەو هەواڵەی دووەمەی لێنەدەخوێنرایەوە.

ـ بێکەسترین لە دایکبووی سەر ئەم خاکەم

دە بەس قاقام بۆ بکێشە

باسی شیعرم دەکەم شیعرم... مارف ئاغایی

لەم پارچەیەشدا، بە هەمان شێوەی نموونەی یەکەم، بەشی یەکەمی شیعرەکە، کە رستەی یەکەمە، رستەیەکی هەواڵی ئاشکرایە، کە دەکەوێتە بەر گوێی خوێنەر، یان بەرامبەر، ئەو یەکسەر لە واتا تێدەگات، هەست دەکات، ئەم هەواڵە زۆر ورد و دروست نییە، بۆیە جۆرێك لە گاڵتەی پێدێت و پێدەکەنێ، کەچی شاعیر بەو پێکەنینەی بەرامبەرەکەی رازی نییە، پێی دەڵێت: بۆچی بە من پێدەکەنی؟! خۆ من باسی خۆم ناکەم وەکو ئادەمیزادێك، بەڵکو من مەبەستم شیعرمە شیعرم!! لە راستیشدا ئەمە فێڵکردنە و راگۆڕینە، دەنا رستەکەی یەکەم، ئەو هەواڵەی دووەمەی لێنەدەخوێنرایەوە.

### خۆهەڵەکردن:

(خۆهەڵەکردن) لە عەرەبیدا (تجاهل العارف)ی پێدەڵێن.. لە کوردیشدا (راگومکی ئاشنا) و (خۆگێل کردن)ی بۆ بەکارهێنراوە.. بریتییە لە خۆهەڵەکردنی شاعیر بەرامبەر شتێك، کە باش دەزانێ راستی ئەو شتە چییە، یان چۆنە، بەڵام بۆ مەبەستێکی تایبەت، بەوشێوەیە خۆی هەڵەدەکات، بۆ وێنە:

ــ وتم شارەزوور چیت لێ قەوماوە

کێ تۆی کردووە، بە بەحرو ئاوە

بۆم بگێڕەوە، سەرانسەر ئەحواڵ

له داخت دلّم بوو به کۆی زوخاڵ
گەلی (پاشاریێ) تاسەر سوورە جۆ
تیایا ئەوەزێ کۆماران کۆکۆ
کوا؟ دوانزە هەزار عێلی کوردەوار
گشت بەسەر تۆدا دەیکرد راگوزار
کوا دوانزە هەسوون، ماڵە میرانت
کوا سەدای تەپڵی سەر کۆمارانت... محەمەد ئەمین خدر

کە ئەم پارچەیە دەخوێنینەوە، هەست دەکەین بارێکی نائاسایی بەسەر شارەزووردا هاتووە، بە هۆیەوەی هەموو ئەو بەڵایانەی تێ کەوتووە، کە شاعیر ئاماژەیان بۆ دەکات، بەڵام بۆ چ راستەوخۆ ناڵێت، فلانە هێز، یان دەسەڵاتدار هێرشی کردە سەر شارەزوور، خەڵکی کوشت، ماڵی تالان کرد، جوانییەکەی شێواند؟ بۆ چ بەوشێوە خۆی هەڵە دەکات و یەك لایەنە داخی دڵی لە چەند پرسیارێکدا کورت دەکاتەوەو ئاراستەی شارەزووری دەکات؟ ئەمە دیارە لەبەر هۆی سیاسییە، هەلْ و مەرجە سیاسییەکە رێگەی ئەوەی نەداوە، ئاشکراو روونتر قسەکانی بکات، بۆیە هەر تەنها بەو خۆهەڵەکردنەی، هۆنراوەکەی دادەرێژێت.

ـ وەڵاتێ من کا بێژە من
چ ناڵینە ئەڤرۆ ژ تە تێت؟
چ بازارە؟ چ هاوارە؟
ئەزا دبینم... سعاد سلێڤانەیی

ئەم پارچەیە سەرەتای هۆنراوەیەکە، شاعیر تیایدا خۆی بێئاگا دەکات و وەکو نەزانێك پرسیار لە وڵاتەکەی دەکات، هەرچەندە خۆیشی دەزانێت وەڵامی پرسیارەکانی چییە، ئەمەش (خۆهەڵەکردن)ە.

## جیاوازی نێوان (بەهەڵەبردن) و (خۆهەڵەکردن):

گەربێت و نموونەکانی پێشووی ئەو دوو هونەرە بەراورد کەین، کە لە بۆ هەریەکەیان ئاماژە بۆ کرا، دەکرێ گرنگترین جیاوازییەکانیان لە مانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١ـ (بەهەڵەبردن) لەو دەربڕینانە بەرجەستە دەبێت، کە بریتییە لە وتووێژی نێوان دووکەس، بەڵام (خۆهەڵەکردن) کاتێ دروست دەبێت، کە شاعیر لە شێوەی پرسیارکردن لە کۆمەڵێ شتدا، بێ رەچاوکردن و ویستنی وەڵامی بەرامبەر دەیانخاتەروو.

٢ـ لە (بەهەڵەبردن)دا هەردەم کە دووکەسی بەرامبەر قسە بۆ یەك دەکەن، هەمیشە مەبەستی قسەکەری یەکەم لە قسەکەی، بە هەڵەبردنی دووەمە، بەڵام دووەم درەنگ تێی دەگات، کەچی لە(خۆهەڵەکردن)دا شاعیر خۆی هەر لەسەرەتاوە دیارە، کە لە راست ئەوشتەی باسی لێوە دەکات گوایە لێی بێئاگایە، لە راستیدا لێی بێئاگا نییە، بەڵام بۆ مەبەستێکی تایبەت خۆی هەڵە دەکات.

## گردکردنەوە:

(گردکردنەوە) لە عەرەبیدا (العقد)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە دارشتنەوەی پەخشان بە شیعر، با ئینجا لەم پێناوەشدا وشەکانی دەقی یەکەم: کەم، یان زیاد بکەن، چونکە گرنگ ئەوەیە هۆنراوە تازەکە هەمان واتاکانی پەخشانەکەی بناغەی بەخۆوە گرتبێت.. بۆ نموونە:

ـ مردن جارێکە بە درێژی ژیـــــان
بۆ هەموو رۆژێ بمرین بێ تاوان... مەدحەت بێخەو

ئەم دێڕە شیعرەی (بێخەو) گرد کردنەوەی ئەو پەندەی پێشینانە، کە دەڵێت: (پیاوی ئازا جارێك دەمرێت، پیاوی ترسنۆك رۆژێ سەد جار).

## چەند جۆرێکی گردکردنەوە:

١ـ گردکردنەوەی تاکە رستە: لێرەدا ئەوەی گرد دەکرێتەوە، قسەیەکی نەستەق، یان پەندێکی پێشینانە.. بۆ نموونە:

ـ لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە
جەردە رووتتکا با لەو بەرەوە... پیرەمێرد

(له پردی نامەرد مەپەڕەرەوە) لەو پەندە گرد کراوەتەوە، کە دەڵێت: (نامەرد ئەگەر بووە پردیش، بەسەریدا مەپەڕەوە)، شاعیر هەمان مانای پەندەکەی بە پوختتری خستۆتە نێو دێڕەکەی.

ـ سوحبەتی نادان تاڵ رابواردنە
لە دوای کەر رۆیین تەرس بۆنکردنە... پیرەمێرد

نیوە دێڕی دووەم (لە دوای کەر رۆیین تەرس بۆنکردنە) لەو پەندە پێشینانە گرد کراوەتەوە، کە دەڵێت: (ئەوەی لە دوای کەرێ بڕوات، هەر تەرس بۆنکردنی بۆ دەمێنێتەوە). شاعیر ئەو پارچە پەخشانە بچووکەی گرد کردۆتەوەو بەو جۆرە بە پوختی خستویەتییە نێو دێڕەکەی خۆی، واتە لە ژمارەی وشەکانی کەمکردۆتەوە، بەڵام پارێزگاری لە واتاکەی کردووەو وەکو خۆی هێشتوویەتییەوە.

ـ لە باپیران دەگێڕنەوە
تەنیا بە هۆی گوڵەگەنمێك
سەدان زیوان
تێر ئاو دەبێ و خۆراك دەخوا
بەڵام نابێ و هەرگیز نابێ
ئاغا بێت و
نانی پاڵە و جوتیار بخوا... جەمال گردەسۆری

گردکردنەوەی ئەو پەندەی پێشینانە، کە دەڵێ: (بە وای گوڵە گەنمێك سەد گوڵە زیوان ئاوی دەخواتەوە).

ـ کۆرە هەژاربێ وەیاخود ئاغە
هیواو ئاواتی هەر چاوی ساغە... جەمال گردەسۆری

ئەمە گردکردنەوەی ئەو پەندەی پێشینانە، کە دەڵێ: (کۆر تا دەمرێ بە تەمای چاوە).

٢ـ گردکردنەوەی ڕووداوی مێژوویی: لێرەدا ئەوەی گرد دەکرێتەوە، ڕووداوێکی مێژووییە..
بۆ نموونە:

ـ پێشەواکەم
وای لە پێش چاوم ئەتبینم
بەسەر (صەفا)وە وەستاویت
خۆت چاکخوازیت
دەتەویست خەڵکیش چاکخواز بن
لە تاریکی دەستەکێشان
بەرەو ڕووناکی دەتبردن
کەچی ئەوان
نزیکترینی کەسانت
مامەی لە هەق هەراسانت
(بولەهەب)ی جەهەننەمی
لە باتی پشتیوانیت کا
کۆمەکت بێ
وەکو هار بەربوویە گیانت
(تەببەن لەکە)ی پێ ئەوتیت
بەو هیوایەی
گەرمی دڵت دامرکێنێ و
دەس بکێشێت لە قورئانت... جەلالەدین نەجمەدین

ئەم پارچەیە (گردکردنەوە)ی پارچە پەخشانێکی مێژووییە، کە لە سەرچاوەکانی (سیرە)دا بەم شێوەیە هاتووە: ئیبن و عەباس (ڕەزای خوای لێبێ دەفەرمووێ: کە ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلأَقْرَبِينَ﴾ دابەزی، (کە ئەمە ئایەتی ژمارە (٢١٤)ی سوڕەتی پیرۆزی (الشعراء)ە. نووسەر ـ ) پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) چووە سەر تەپی صەفاو کەوتە بانگکردنی قوڕەیشییەکان: ئەی نەوەی فەهر.. ئەی نەوەی عەدی.. هەتا هەموو تیرەکانی بانگکرد، قوڕەیشییەکان وتیان: محەمەد بانگ دەکات، ئیدی هەموو ڕوویان تێکرد، چونە لای بۆ ئەوەی بزانن بۆچی بانگیان دەکات؟ پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) لەوکاتەدا پێی

فەرموون: ئەگەر هەواڵتان بدەمێ، هۆردوویەك وا لەو شیوەدا ـ یا لە پشتی ئەو کەژەوە ـ دەیەوێ هێرش بکاتە سەرتان، ئایا باوەڕم پێدەکەن؟ وتیان: بەڵێ، چونکە هیچ درۆیەکت لێنەبیستراوە. فەرمووی: دەی دەتانترسێنم بە سزای سەختی خودا، ئەگەر باوەڕ بە خودای تەنیا نەهێنن و موسڵمان نەبن و واز لە بتپەرستی و لە هاوەڵدانان بۆ خودا نەهێنن.. ئەی نەوەی عەبدولمەناف.. ئەی نەوەی زوهرە.. ئەی نەوەی تەمیم.. ئەی نەوەی مەخزوم.. ئەی نەوەی ئەسەد.. خودا فەرمانی پێداوم کە خزمە نزیکەکانم بترسێنم، من لەم جیهانەداو لە پاشەڕۆژیشدا ناتوانم هیچ کەڵك و سوودێکتان پێبگەینم، هەتا شایەدومان نەهێنن و نەڵێن: (لا اله الا الله).

دوای ئەمە ئەبو لەهەبی مامی کە پیاوێکی قەڵەوی رقئەستوور بوو، راست بووەوەو هاواری کرد: (تبا لك! ألهذا دعوتنا).. واتە: گوتی: داماوی بۆ تۆ! ئا بۆ ئەمەت کۆکردینەوە؟! پێغەمبەری خوداش بە دڵتەنگییەوە بۆی رووانی؟! زۆری پێنەچوو خوای گەورە لە جیاتی پێغەمبەرە شیرینەکەی وەڵامی (ئەبولەهەب)ی دایەوەو ئەم سورەتەی نارده خوارەوە: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ (١) مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ (٢) سَيَصْلَىٰ نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ (٣) وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ (٤) فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ(٥)﴾. (ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی بوخاری بە ژمارە: ٤٧٧٠ و صەحیحی موسلیم بە ژمارە ٥٠٧ و لە گەلێ کتێبی دیکەی فەرموودەدا هاتووە. (بڕوانە: عەبدولعەزیز پارەزانی، ژیانی پێغەمبەری مەزن، لا ١٢٣و١٢٤).

شاعیر ئەم پەخشانەی کردووە، بەو شیعرە.

٣ــ گردکردنەوەی حاڵەتێکی واقیعی.. لێرەدا ئەوەی گرد دەکرێتەوە، حاڵەتێکی واقیعییە.. بۆ نموونە:

ـ خۆی پێوا گوتی باڵا شەش گەزم!

سەیرم کەن ئەزم وا هەڵدەبەزم؟!... پیرەمێرد

ئەم دێڕە لە حاڵەتی ئەو کەسە گرد کراوەتەوە، کە: کەسێکی بێدەسەڵاتە، رۆژێکیان بە تەنیا دەبێت و بێ ترس بە رێدا دەڕوات، زۆر خۆش دەڕوات و بەمە هەوایەکی دەچێتە ناو قەلبی، شانازی بە خۆ دەکات و دەڵێت: ئەوە ئەزم؟! وا دەبەزم؟! شاعیر ئەو حاڵەتە کۆنەی ئەدەبی فۆلکلۆر و سەرزاری خەڵکی هێناوەو لەو دێڕەی خۆیدا گردیکردۆتەوە.

٤- گردکردنەوەی حەکایەتێکی فۆلکلۆری، یان میللی، یان چیرۆکێکی هونەری، یان هەر پارچە پەخشانێکی دیکە.. بۆ نموونە:

ـ خدر بوو پیاوی حەسەن ئەفەندی
کەس پێی نە ئەوت کەرت بە چەندی
کوێخا دەرگابوو جێی خواجا نشێن
فەرەنجی پۆشبوو زستان و هاوین
ڕەنجبەری ماڵێك ڕۆژێك نەخۆشکەوت
ناچار ئەو ڕۆژە بێگاری بەرکەوت
پێنج کەری ئەبرد بۆ دێی کەڵەگن
کە لەسەر خەرمان کای بۆ دابگرن
لە ریێ خۆی سواری یەکێکیان بووبوو
کە ئەی ژماردن هەر چواریان مابوو!
وتی: ئای خۆ من پێنج کەرم پێ بوو
وا چواریان دیارە ئەوی تر کوێ چوو؟!
ڕووانی بۆ دواوە هیچ دیار نەبوو!
گەڕایەوە لای کەران زوو بە زوو
کە تەماشای کرد پێنج کەر تەواوە
لەم فەن و فێڵە سەری سوڕماوە
زۆر ماندوو بووبوو دیسان سوار بۆوە
لە بەرەوژێرە سەرەوخوار بۆوە
دیسان کە رووانی کەر چواریان ماوە
گریا، گوتی: من چیم لێ قەوماوە؟!
خۆی خستە خوارێ بە دوعاو نزا
ئەپاڕایەوە لە بارەگای خوا
دوعای گیرابوو، روانی کەر پێنجە
ڕزگاری بووبوو لەم دەرد و ڕەنجە
ئیتر نەیتوانی بڕوات بە پێیان

خۆی هەڵدایە سەر کەرێکی تریان
دووبارە بەزمی لێهاتەوە دی
وتی: ئەمجارە کەرە گورگ خواردی
هەروا لێی خوڕی گەییە نیوەڕێ
بەرەو پیری هات خلەی کوێخا دێ
بانگی کرد: کێخوا لە دەورت گەڕێم
لە کوێ خوا وا تۆی هێنایە سەر ڕێم
ئەمڕۆ جنۆکە گاڵـەم پێ دەکەن
جارێ کەرێکم ئەدزن و ئەیبەن
وتی: خدر ئاغا چەند کەرت پێ بوو؟
چەندەیان ماون و چەندت لە کیس چوو
وتی: پێنج کەرم هێنابوو لە شار
کە ئەیژمێرم هاتۆتە سەر چوار
کێخوا تێگەیشت، کە گونی و گێژەر
لێکناکاتەوە کابرای قوڕ بە سەر
ئەو کەرەی کەوا خۆی سواری بووە
چونکە نایبینێ لە بیری چووە
وتی: دابەزە هەی بەندەی بێغەش
پێنجی بۆ ژمارد خۆشی کرد بە شەش!!... پیرەمێرد

ئەم چیرۆکە شیعرە لە حەکایـەتێکی (جوحـا)، یـان (مـەلا مەشـور) وەرگـیراوە، شـاعیر حەکایەتەکەی هێناوە و بە شیعر گردی کردۆتەوە، بەڵام لێرەدا زیادیشژی خسـتۆتە سـەر، بـۆ ئەوەی مەبەستەکانی خۆی باشتر بپێکێت.

لە حەکەیاتەکەی (مەلا مەشور)دا هاتووە: (... ڕۆژێکیان مەلا مەشور بەرەو بازاڕ چوو و شەش کەری پێ بوو، پاش ماوەیەك ماندوو بوو، سواری پشتی یەك لە کەرەکان بوو، لە پاشان کەرەکانی ژمارد، بینی پێنج ماون، دابەزی و لە پشـت کـەری شەشـەم ڕۆیشـت، ئـاوڕی بـۆ پشتەوە دایەوە، هیچی نەدیت، هاتەوە پێش کەری شەشەم و دیسان کەرەکانی ژمـارد، بینـی

هەر پێنجن، چووەوە پشت کەری شەشەم ئەمجارە ژماردنییەوە بینی شەشن، بەمە دڵخۆشبوو و دیسانەوە سواری کەرێکیان بووەوە.

ئەمجارەش پاش کەمێکی تر کەرەکانی ژماردنەوە، دیسانەوە بینی پێنج کەرن، بۆیە بە پەرۆشییەوە هەر دەیژماردن و دەیژماردنەوە، هەر پێنج دەردەچوون، ئا لەو کاتەدا کەوتە بەرچاوی برادەرێکی، پێی گوت: چییە ئەوە مەلا؟!

مەلا مەشور گوتی: لەماڵەوە دەرچووم شەش کەرم پێ بوون، پاش ماوەیەك بوونە پێنج، دوای کەمێك بوونەوە شەش، ئێستا تەماشا دەکەم، دیسانەوە بوونەتەوە پێنج!!! ئەها تەماشایان بکە: ئەوە یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج.. ئەدی کوا ئەوی تر چی بەسەر هات؟!!

برادەرەکەی پێی گوت: مەلا ئاخر ئەتۆ لەسەر شەشەمیانی، لەبیرت کردووە ئەوەی ژێرە خۆت بژمێری)!!!

بێخەوی شاعیریش لەمڕووەوە هاتووە پێنج سەربردەی فۆلکلۆری کردووە بە شیعر، یەك لەو سەربردانە سەربردەی (بڕینـــــی قســـــە)یە، کە خۆی بە (پەخشان)ەو بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

... دەگێڕنەوە: لە یێك لە گوندەکانی بنار شاخدا، مامە پیرەیێك رزق و رۆزی رۆژانەی لەسەر داربڕین دەبێت، بۆیە رۆژانە لە ماڵ دێتەدەر و، دەچێتە نێو دۆڵەشاخەکان، دەست دەکات بە دار بڕین، تا بارە گوێدرێژێکی باش کۆدەکاتەوە، ئینجا لە پشتی گوێدرێژەکەی بارەکات دەیهێنێتەوەو، دەگەڕێتەوە.

ئەو شاخانەش چۆڵ دەبن، بەڵام ورچێك دوور و نزیك ئاگاداری لەو مامە پیرەیە دەبێت، کە دەبینێت، بە دەست داربڕین چەند ماند و دەبێت، بڕیار دەدات لەمەولا ئێواران ئەو خۆی لە باتی مامە پیرە دارەکان ببڕێت، تا بەیانی کە ئەو دێت، ئەزیەت نەکێشێت، بارەکەی هەڵگرێت و، بڕوات.

رۆژێك و دووان و سییان مامە پیرە تەماشا دەکات، بەیانییان کە دێت بارەداری بۆ ئامادەکراوە، سەرسام دەبێ و، نازانێت کێیە ئەو چاکەیەی لەگەڵ دەکات، تا رۆژێکیان ورچەکە خۆی نیشان دەدات و، تێیدەگەینێت، کە:

ـ ئەوە منم رۆژانە ئـــــــــــەو دارانەت بۆ دەبڕم، چونکە دەبینم تۆ بەساڵاچووی و، هەست دەکەم زۆر ماندوو دەبی، بۆیە بە پێویستم زانی ئەو یارمەتییەت بدەم.

بەمەش مامە پیرە و ورچە دەبنە دۆست و خۆشەویستی یەکتری، ماوەییێکی پێدەچێت، رۆژێکیان مامە پیرە بە ژنەکەی دەڵێت:

ـ خواردنێکی خۆشم بۆ دروست بکە، بەیانی لەگەڵ خۆمی دەبەم، دەعوەتی ورچەی برادەرمی پێدەکەم، چونکە بە راستی چاکەیەکی زۆری لەگەڵ کردومەو، خۆم بە قەرزاری دەزانم.

ئەویش مەنجەڵە خواردنێکی خۆشی بۆ دروست دەکات و، مامە پیرە لەگەڵ خۆی دەیهێنێت، دەبینێت، وەکو رۆژان ورچە دارەکانی بۆ بڕییەو، ئامادەی کردووە، پێکەوە لە گوێدرێژەکەی بار دەکەن، ئینجا مامە پیرە بە ورچە دەڵێت:

ـ ئەوە خواردنێکی باشم هێناوە، بۆ ئەوەی دەعوەتی تۆی پێبکەم، جا فەرموو با دابنیشین بە یەکەوە بیخۆین.

ورچەش لەگەڵی دادەنیشێت و، تا تێر دەبن خواردنەکە دەخۆن، لە پاشان ورچە باوێشکێکی دێتێ، کە دەمی دەکاتەوە بۆنێکی ناخۆش لە دەمی دەهێتەدەر، بەمەش مامە پیرە جاڕس دەبێت و، بەبێ هیچ یەك و دوو کردنێك پێی دەڵێت:

ـ بە راستی بۆنی دەمت ناخۆش بوو.

ورچە ئەمەی زۆر پێناخۆش دەبێت، بەڵام بەسەر خۆی ناهێنێت و، وا پیشان دەدات، کە تێنەگەیشتووە، هەر چشی گوتووە، بەڵام مامە پیرە دووبارەو سێ بارەی دەکاتەوە، بەوەش ورچە لەجێی خۆی سارد دەبێت، هێندەی پێ تێك ناچێت، کەس بزانێ، بۆیە بە غەمبارییەوە بە مامە پیرە دەڵێت:

ـ لەمڕۆ بە دواوە برادەرایەتی من و تۆ تەواو بوو، بەڵام نەك هەر ئەوەش، بەڵکو دەبێت ئەو تەورەتم لە نێوچەوانی بدەیت و، بمکوژی، دەنا من رازی نابم و، خراپت بەسەر دێنم.

مامە پیرە زۆر هەوڵ دەدات، کە لەو داوایەی رزگاری بکات و، پەشیمان ببێتەوە، واز لەو قسانەی بێنێت، بەڵام ورچە بە قسەی ناکات، بۆیە ناچار تەورەکەی بەرزدەکاتەوە، لە نێوچەوانی ورچەی دەدات، ئینجا بەجێی دەهێڵێت.

پاش ئەوە ماوەییێکی باش مامە پیرە ناوێرێت بچێتەوە ئەو جێیە، نەوەکو نەوەکانی ئەو ورچە تۆڵەی لێبکەنەوەو، بەڵایەکی بەسەر بێنن، چونکە ئەو هەر لەو بڕوایە بوو، کە ورچەی کوشتووەو، تەواو.

بەمەش ئیشەکەشی دەفەوتێت و، زۆر شپرز دەبێت، بۆیە ناچار پاش ساڵێك کە ترسەکەشی کەمتر دەبێتەوە، دیسانەوە بۆ دارکردن دێتەوە هەمان جێ، لە ناکاو ورچەکەی برادەری لێ پەیدا دەبێتەوەو، دەبینێ وەکو جاران چاك بۆتەوە، ئەوەش مامە پیرە سەرسووڕماو دەکات و، وای لێدەکات بە حەپەساوییەوە پرسیار لە ورچە بکات، پێی دەڵێت:

ـ ئەوە تۆ ماوی؟! بۆ چما برینی تەورەکەت پڕ بووەوە؟!

ورچە وەڵامی دەداتەوە:

ـ بەڵێ.. وەکو دەبینی برینی تەورەکەت پڕ بوویەوە، بەڵام برینی قسەکەت تا ئێستاش پڕ نەبووەتەوەو، هەر خوێنی لێدەچۆڕێت.

ئەم سەربردەیەی سەروو، کە بە شێوەی (پەخشان) لە فۆلکلۆردا باوەو بەسەر زاری خەڵکەوەیە، (مەدحەت بێخەو) هاتووە بەو شێوەیەی خوارەوە کردوویەتی بە (شیعر) و (گردی کردۆتەوە)، (بێخەو) دەڵێت:

ـ منداڵەکان هەبوو نەبوو
لە ناو کێوێك شێرێك هەبوو
شوێنی دۆڵێکی بەردار بوو
هەر خۆی مەلیکی ئاقار بوو
بە فەرمانی شێری سامدار
قەدەغەبوو بڕینی دار
دارکردنیش بۆ دانیشتووان
سەرچاوە بوو بۆ گوزەران
لە ناو گوندۆکەکی بنار
مام (پیرۆت)ێك هەبوو هەژار
لەبەر تاڵی گوزەرانی
تەواو بێزار بوو لە گیانی
بەیانییەك بڕیاری دا
بۆ دارکردن بڕوا بۆ چیا
بۆ دارستانی شێر بچێ

یان تێدەچێ، یان دەردەچێ
لەگەڵ ڕەوتی کوچەکەری
بۆ ناو کێو هەنگاوی بڕی
تا گەیشتە دۆڵی بە دار
وەستا بە دڵی خورپەدار
بە پەلەو بە ترس و لەرزین
بە (بیور) کەوتە دار بڕین
مام پیرۆت هەر هێندەی زانی
شێر لەپی نایە سەر شانی
گوتی: ئەی نەگبەتی نەزان
چۆن وێرای بێی بۆ دارستان
ئێستا لەت و پەتت دەکەم
بۆ عالەم بە پەندت دەبەم
مام پیرۆت بە دەنگی گریان
بۆ شێر کەوتە دەخیل ئامان
گوتی: من یەکجار هەژارم
بێ کار و بێ نان و دارم
لە ترسی لە برسان مردن
ناچار بووم بێم بۆ دارکردن
تۆ مەلیکی ئاژەڵانی
گەورەی کێو و دارستانی
لێم ببوورە تاکو مردن
چیتر نایێم بۆ دارکردن
شێر گوتی: مادام هەژاری
هەندە عەبداڵ و ناچاری
لێـتدەبوورم لەمەو دوا
بۆ خۆت دار ببڕە بێ پەروا

بەڵام ئەگەر چوویتە شاری
دونگم بۆ بێنە بە دیاری
پیرۆت بەمە گەشایەوە
داری کرد و گەڕایەوە
هەمان رۆژ ریێی شاری بڕی
داری فرۆشت، دونگی کڕی
ئەمجارەیان زوو بێ ترسان
ڕوو دەکاتەوە دارستان
دەچێتەوە شوێنی جاران
دەکەوێتە گیانی داران
بەڵام لەپڕ شێری چەلەنگ
پەیدا دەبێ بێ هەست و دەنگ
مام پیرۆت دونگ دێنێتە دەر
ئەڵێ فەرموو شێری سەروەر
شێر دوونگ ئەداتە بەر قەمپار
بە پەلە پەل هەروەکو هار
ئەڵێ پیرۆت بڕوانە بۆم
پێم بڵێ وەکو چی دەیخۆم
پیرۆتی نەگبەت و نەفام
بە گەمژەڵی دێتە وەڵام
ئەلێ: چیت پێ بڵێم قوربان
بە پەلە دەیخۆی وەك سەگان
شێر بەم وەڵامە شڵەژا
تێکڕا هەموو لەشی هەژا
بە دەنگی بەرز کەوتە نەڕین
ئاژەڵانی خستە لەرزین
هەردوو چاوی سوور هەڵگەڕا

مام پیرۆت ڕەنگی لێبڕا
گوتی: ئەی پیرۆتی بەدفەڕ
سفلەی ناپیاو، ئەی ئاخر شەڕ
وەرە زوو تەورەکەت بێنە
بەتین لە منی بووەشێنە
پیرۆت کەوتە تکا کردن
بۆ بەخشین و بۆ لێبووردن
شێر نەڕاندی و لێی چووە پێش
گوتی: بێدەنگ و کێشمەکێش
چیم پێ گوتی گەر وانەکەی
هەر ئێستا خۆت لە ناو ئەبەی
ناچار پیرۆت بە ترسەوە
تەورەکەی بەرز کردەوە
دای لە شێری توڕەو غەمبار
خوێن بە شانی داهاتە خوار
شێری زامدار بە لارە لار
ڕوویکردە ئەشکەوتی کۆسار
پیرۆت تەواو چەواشە بوو
بێ دار کردن گەڕاوە زوو
دوای چەند ڕۆژێ وەکو جاران
بە دوو دڵی چوو بۆ داران
چەند ڕووانی شێر دیار نەبوو
بێ پەروا دەهات و دەچوو
وایدەزانی شێر فەوتاوە
خۆی خاوەن کێوە لەم ناوە
بەڵام دوای مانگێکی تەواو
شێر لێی پەیدا بوو لە ناکاو

گوتی: ها پیرۆتی نەزان
بێ پەروا دێی بۆ دارستان
وەرە بۆ زامم بنوارە
بزانە شوێنەکەی دیارە
پیرۆت گەلێ ورد بووەوە
شوێنی زامی نەدۆزیەوە
بەڵام بینی زامێکی تر
ڕەش و ئاوساو و جەرگبڕ
لەسەر دڵی پەیدا بووە
یەکجار پێی شپرزە بووە
ئەوجا شێری تورەو بە سام
لە مام پیرۆت هاتە وەڵام
گوتی: وا جێی تەورەکەی تۆ
سارێژ بووەو نەیماوە سۆ
بەڵام جێی قسەی ژەهراویت
وشەی ڕەقی ناپیاویت
سارێژ نابێ بێگوومانم
دەبێتە مایەی نەمانم
ئێستا سزای خۆت وەردەگری
دەبێ پێش مردنم بمری
شێر نەڕاندی و هەڵمەتی برد
مام پیرۆتی لەت و پەت کرد
زێڕینە پەندی باپیران
وانەیە بۆ زاناو نەزان
گەلێ جار زامی خەنجەران
سارێژ بۆتەوە بە دەرمان
بەڵام جێی قسەی ناشیرین

ساڕێژ نابێ بە درێژی ژین... بێخەو

ئەم کارەی (بێخەو)یش لـە (ڕەوانبێـژی)دا وەکـو ئاماژەمـان بـۆ کـرد، بـە (گردکردنـەوە) دادەنرێت.. چونکە وەکو گوترا: سەربوردەیەکی لە پەخشانەوە کردووە بە شیعر، کە لەو شـیعرەی (بێخەو) ورد دەبینەوە، دەبینین لە ڕووی داڕشتن و دەربڕینەوە، هەندێ دەستەواژەو ڕستەی لە هی سەربردەکە جیایە، تەنانەت پاڵەوانی سەربردەکەشی گۆڕیوە کە (ورچ)ە، بەڵام لە شیعرەکەی ئەو بووەتـە (شـێر)، جگـە لـەوەش هونـەرکاری جـوانی لـە شـیعرەکەی خۆیـدا کـردووە، کـە لـە (سەربردەکە)دا نییە، بەڵام هەردووکیان هەر یەك پەیام دەگەینن، ئەوەش ئـەوە دەردەخـات، کـە (بێخەو) لە پاڵ (گردکردنەوە)کە داهێنانێکی دیکەشی کردووە، ئەویش ئەوەیە شیعرەکەی خـۆی لەو مادده فۆلکلۆرییە بەو شێوەیە داڕێـژتووە، کـە لەگـەڵ ئـەقڵی منـداڵان و سـەردەمی نـوێ بگونجێت، بەڵام پارێزگاری لە وانەو پەندەکەی سـەربردەکە کـردووەو، هـەر بـە زمانـە سـادەکە هۆنیویەتییەوە بۆ ئەوەی لە ئاستی تێگەیشتنی منداڵان بێت و، ڕوون و ئاشکرا بێت.

## ڕوونکردنەوە:

(ڕوونکردنەوە) لە عەرەبیدا (التفسیر)ی پێدەڵێن.. بریتییە لـەوەی شـاعیر، یـان نووسـەر دوای ئەوەی باس لە شتێکی دیاریکراو دەکەن، دواتر پرسیار بۆ شتەکە دروست دەکەن و، بـە وەڵامی پرسیارەکە شتەکە چاکتر ڕوون دەکەنەوە، بۆ تیگەیشتنی بەرامبەر.. بۆ وێنە:

(دڵدار)ی شاعیریش لەم بارەیەوە، کاتێ دێت لە هۆنراوەیەکەیدا لەسەر زاری ڕەنجـدەرێك قسە دەکات و باس لەوە دەکات، کە پاداشـتی ماندووبوونەکـەم، (تیکـە نانێکـە)، یەکسـەر پرسیار بۆ جۆری نانەکە دروست دەکات، بۆ ئەوەی خەڵك وانەزانێ، نانەکەش نانێکی زۆر باشە و پێخۆرێکی چاکی لەگەڵدایە، دەڵێت:

ـ نرخی ئارەقەی ڕوونی ماندوێتیم

تێکە نانێکە، چ نان؟ نانە جۆ

ئەویش بەبێ دۆ

ئەویش بەبێ دۆ... دڵدار

دەبینین وەصفی تەواوی نانەکەی کردووە، کە نانە جۆیەکی، بێ هیچ پێخۆرێکەو ژیـانێکی مەمرە و مەژی پێدەبەمە سەر، ئەوەش نموونەیەکی (ڕوونکردنەوە)یە لە ڕەوانبێژیدا.

ـ ئەگەر تۆسقالێك پیاوەتیت بووبا
ئەگەر ئاكارت لە ئینسان چووبا
بۆ مشتێ پارەی دوژمنی ناپاك
خوێنی ئەم خەڵكەت نەدەڕشتە خاك
خوێنی کێ؟ خوێنی مەجید و دارا
خوێنی دڵسۆز و شیلان و دانا...دلزار

ڕوونکردنەوە (تەفسیر)ە بۆ خوێن، کە سەرەتا بە گشتی هاتووە، دواتر شاعیر خۆی ڕوونی کردۆتەوە، مەبەستی لە خوێنە ڕژاوەکە کامە خوێنە، کە خوێنی مەجید و داراو دڵسۆز و شیلان و دانایە.

ـ هێشتا شەوی زۆر مابوو، کە من کەوتمە سەحرا
وەك شێت، بەڵام شێتی شیعر، شێتی جوانی... گۆران

لە بەشی یەکەمی گوتە شاعیر دەڵێت: وەکو شێت من کەوتمە سەحرا، ئەمەش بیرێکی تایبەت لە زەینی خوێنەر دروست دەکات، کە وێنەی تایبەتی شێتە، وەکو لای هەموان بەرجەستەیە، کەچی دوای ئەوە شاعیر هەست دەکات، خوێنەر بەهەڵە تێدەگات، بۆیە دێت جۆری شێتییەکە ڕووندەکاتەوەو دەڵێت: بەڵام شێتی شیعرم، نەك شێتی شتێکی دی، بەوەش واتای مەبەست بۆ خوێنەر ڕوون دەبێتەوەو دەزانێ، جیایە لەوەی بۆی چووبوو، ئەوەش (ڕوونکردنەوە)یە.

ـ دەزانن خوێنم
لەگەڵ چ ئاوێ
تێکەڵکردووە؟
ئاوی ئەو بەفرەی
لە لەپی دەستما
گیانی بەخت کرد
تا تێراوم کا... مارف ئاغایی

یەکەمجار شاعیر باسی ئاوێکی کردووە، کە خوێنی خۆی لەگەڵدا تێکەڵکردووە، لە پاشان دەریخستووە، کە مەبەستی لە ئاوەکە ئەو ئاوەیە، کە لەناو دەستی گیانی بۆ بەختکردووە، بەوەش روونکردەوەی بۆ ئاوەکە کردووە.

ـ وادەی کۆچە
گەرەك سازدەی ساز و بەرگ
بۆ کوێ، بەخێر؟ بەرەو مەرگ
لە خاك رواوی
سەد ساڵ ژیاوی
دەچیەوە ناو خاك خاکاوی... د. عەلی شەریعەتی.. و: هەژار

لەم پارچەیەدا لە نیوە دێڕی دووەم، سەرەتا گوتراوە، وادەی کۆچە، گەرەك سازدەی ساز و بەرگ؟ بەڵام شوێنی بۆ کۆچکردن دیار نییە، بۆیە لە پاشان شاعیر خۆی پرسیاری کردووە: بۆ کوێ، بەخێر؟ هەر خۆی وەڵامی داوەتەوە: بەرەو مەرگ! بەوەش روونکردنەوە بەرهەمهاتووە.

**روونکردنەوەی ئاسایی:**

لێرەدا کە وشەیەك دەهێنرێت، تەنیا جارێك و بە یەك شێوە روون دەکرێتەوە.. بۆ نموونە:
ـ خۆزگەی خەمم بە قەڵبەزی سەرچاوەکەی زەڵم
چاو وشکی کرد و ئەو وەکو خۆی تافە تافییە... گۆران

لە نیوە دێڕی یەکەمدا خۆزگەی خەمی خۆی بە سەرچاوەکەی زەڵم دەخوات! ئەمە لەبەرچی؟ وەڵام دیار نییە و هیچی نەگوتووە! بەڵام لە پاشان دێت ئەم هۆیە روون دەکاتەوە، دەڵێت: بۆیە وا دەڵێم، چونکە چاوم هەندێ فرمێسکی لەبەر رۆیی، وشکی کرد، کەچی ئەو هێشتا وەکو خۆیەتی و هەر ئاوی لەبەر دەڕواو هەر تافە تافیەتی! ئەوەش (روونکردنەوەی ئاسایی)یە.

**روونکردنەوەی بەدواییەك داهاتوو:**

لێرەدا لە کۆپلەی شیعری نوێ، وشەیەك کە دەهێنرێت، زیاتر لە جارێك و بە زیاتر لە شتێك روونده‌کرێتەوە.. بۆ نموونە:

ـ دڵدارەکان
دڵدارانی چاوی وشەی باخی ئاگری هۆنراوە
دڵدارانی گوڵی بارانی وەریوی
درەختی خۆری رووتاوە
دڵدارانی نۆ ساڵی ناو وەرزی خوێنی
ئەم خاکە شەهیدکراوە
دڵدارەکان
دڵدارانی چرای زامی ناو چیرۆکە کوژاوەکان
دڵدارانی ماچی تینووی ناو شەپۆڵە خنکاوەکان... شێرکۆ بێکەس

لەم کۆپلەیەدا چەندین جار دڵدارەکان بەدوای یەکدا روونکراونەتەوە، بەوەش (روونکردنەوەی بەدواییەك داهاتوو) بەرهەم هاتووە.

**روونکردنەوەی درێژە:**

لێرەدا لە کۆپلەی شیعری نوێ، وشەیەك کە دەهێنرێت، جارێك روون دەکرێتەوە، لە نێو روونکردنەوەکەش، وشەیەك دەگیرێت و ئەویش روون دەکرێتەوە.. بۆ نموونە:

ـ لە ناو شاری زامەکانما.. وشەکانم
نمەن
نمەی بارانێکی تێنوو
بارانی ژانی هەورێکی سەرهەڵگرتوو
بارانی خەمێکی سووری
گڕ تێبەربوو... شێرکۆ بێکەس

لەم کۆپلەیەدا سەرەتا شاعیر کە باس لە ناو شاری زامەکانی دەکات، دەڵێت:

(.. وشەکانم نمەن).. پاش ئەوە یەکسەر وشەی (نمە) روون دەکاتەوەو دەڵێت: (نمەی بارانێکی تێنوو).. ئینجا لەنێو ئەم رستەی روونکردنەوەش وشەی (باران) وەردەگیرێ و بۆ جارێکی دیکە، ئەمجارە وشەی (باران) روون دەکاتەوەو دەڵێت: (بارانی ژانی هەورێکی سەرهەڵگرتوو.. بارانی خەمێکی سووری گڕ تێبەربوو)!! بەوەش (روونکردنەوەی درێژە) دروستبووە.

**وەرچەرخان:**

(وەرچەرخان) بەو دەربڕینە دەگوترێت، کە تیایدا شاعیر سەرەتا باس لە شتێك بکات. بەڵام کە لە درێژەی باسەکەیدا دەگاتە شتێکی تایبەتی، لە باسەکەی یەکەمی وەردەچەرخێ و باس لە شتە تازەکە دەکات.. بۆ وێنە:

ـ جوانی ئێستا مەرجی ڕەوشتە

ڕەوشت هەروەکو کۆڵەگەی پشتە...سەعدوڵڵا پەرۆش

شاعیر باس لە جوانی دەکات، وای دەردەخات کە ئەمە مەرجی ڕەوشتە، بەڵام دوای ئەوە لە نیوە دێڕی دووەمدا، یەکسەر لە باسەکەی لادەدات و دێت باسەکەی دەگۆڕێ، ئەمجارە بۆ ڕەوشتەکە وەردەچەرخێ، کە زووتر باسی کردووەو باس لە ئەو دەکات.

**جیاوازی نێوان ڕوونکردنەوە و وەرچەرخان:**

لە ڕوونکردنەوەدا، ئەوشتەی ڕوون دەکرێتەوە، باسەکە لەسەر ئەوە، بەڵام لە وەرچەرخاندا ئەو شتەی ڕوون دەکرێتەوە، شتێکی لە ناکاو هاتۆتەپێشە، نەك شتە باسکراوە بنجییەکە، بۆیە هەموو (وەرچەرخان) ڕوونکردنەوەیە، بەڵام هەموو (ڕوونکردنەوە)یەك وەرچەرخان نییە.

**دەرهێنان:**

دەرهێنان بریتییە لە ئاخاوتن بە شێوەییێکی هەواڵی دروست، کە هەواڵەکە بە یەك شێوەی گشتی واتا دەگەینێت، کەچی دواتر شتێك لە نێو ئەو شتە گشتییە دەردەهێنرێت.. یان بە واتایەکی پوختتر: دەرهێنان بریتییە لە دەرهێنانی شتێکی تایبەت لە نێو شتێکی گشتیدا.. بۆ نموونە:

ـ ئیتر ئاخ ئیتر ناتبینم هەرگیز

لە خەوا نەبێ شەو شەوی پاییز... گۆران

ناتبینم گشتییە، هەرگیز جەخت لەسەر نەبینینەکە دەکاتەوە، کەچی دوای ئەوە بینین لە شەوی پایز دەرهێنراوە لەو بڕیاری نەبینینەوەی گشتییە، چونکە بینین ئەگەر لە خەویش بێ، هەر بینینە، خەونیش جیهانێکی تایبەتەو لەوێدا بە بەزەیی خودا ئازیزەکان بۆ ساتێ دەگەیێنرێنەوە یەك.

جاری واش هەیە (دەرهێنان)ەکە لە شێوەی ئەگەر دەخرێتەروو، بۆ نموونە:

ـ لە لالەزاری جوانیت نیشانەیەك مابێ

هەر ئەو فوغانەیە ئەڕژێ لە ماتەمی یاران... گۆران

مەبەستی ئەوەیە، لە لالەزاری جوانیت ئەگەر چ نیشانەیەك مابێت، تەنها ئەو فوغانەیە، کە لە ماتەمی یاران دەبیسرێت.

ـ ئەم پەناگەو
ئەم سەیرانگایە بەهەشتە
هیچ ئاوازێکم بۆ نالێ، گریان نەبێ... کۆساری

لە دوا دێڕدا شاعیر سەرەتا بە گشتی دەڵێت: (هیچ ئاوازێکم بۆ نالێ)، ئەمەش مانای نەگوتنی هەموو ئاوازێك دەگرێتەوە، بەڵام دواتر هەر شاعیر خۆی (گریان) جیادەکاتەوە، لەناو ئەو گشتەو بەوە دەیەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە، کە ئەم پەناگە و ئەو سەیرانگایەی وەکو بەهەشتە بە تەنیا (گریان)م فێردەکەن، ئەوەش (دەرهێنان)یە.

ـ ئەم نوزە نوزەی بەیانە
هیچ هەواڵێکم ناداتێ
مەیتی گەلارێزان نەبێ... کۆساری

لە دێڕی دووەم (هیچ هەواڵێکم ناداتێ)، کە دراوەتە پاڵ (نوزە نوزی بەیان)، ئەمە بڕیارێکی گشتیە و خوێنەر لەوە دووردەخاتەوە بیری بۆ هیچ هەواڵ پێدانێك بڕوات، بەڵام دواتر (مەیتی گەڵارێزان) دەردێنێت و دەڵێت بەس ئەوەم پێدەدات، بەوەش (دەرهێنان) بەرهەم هاتووە.

### هێماکەر:

(هێماکەر) لە عەرەبیدا (الارصاد)، یان (التسهیم) و (التوشیع)یشی پێدەگوترێت، ئەگەرچیش هەبێ جیاوازی لە نێوان ئەم دووانەی دواییش کردبێ.. بریتییە لەوەی لە دەربڕینێدا شتێکی وا پێشبکەوێت، کە دەلالەت لەسەر بەشەکەی دوایی دەکات، ئەمەش جارێ بە واتاو، جارێ بە وشە. بە واتایەکی تر: شاعیر، یان نووسەر لە دەربڕینەکەی خۆیدا چ بە واتا، چ بە وشە، کە بەشی یەکەمی قسەکەی دەکات، هێشتا بەشە دووەمەکەی قسەکەی نەکردووە، بەڵام

خوێنەر تێدەگات، یان بیری بۆ دەچێت، کە ئێستا بەو شێوەیە دەبێ کۆتایی بە قسەکەی بێنێ.. بۆ وێنە:

ـ دەوڵەمەند زەکات نادەن بە ئیحسان

ڕاستی نامێنێ زۆر ئەبێ بوختان... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی دووەمدا دیسان بە هەمان شێوە مادام ڕاستی نەمێنێ، دیارە درۆو بوختان زۆر دەبن، بۆیە بەر لەوەی شاعیر بڵێت (زۆر دەبێت بوختان) هێشتا هەر قسەی یەکەمی کردووە، خوێنەر بیری ئەوەی بۆ دروستبووە، کە ئێستا دەڵێت: (زۆر دەبێ بوختان).

ـ جەهلە تاریکە شەوی کورد

خوێندنیش تیشکی هەتاو... پیرەمێرد

لەم دێڕەشدا بە هەمان شێوە، مادام جەهل و خوێندەواری دژیەك بن، کەوابێت ئەگەر جەهل تاریکە شەوی کورد بێت، ئەوا بێگومان خوێندەواریش تیشکی هەتاویەتی، بۆیە بەر لەوەی شاعیر نیوە دێڕی دووەم بڵێت، هەر کە نیوە دێڕی یەکەمی دەخوێنێتەوە، خوێنەر بیری بۆ ئەوە دەچێت، کە ئێستا چ دەڵێت، چونکە ڕستەی یەکەمی هێماکەرە بۆ ئەوەی دووەمی، هەر ئەو دوو شتەش هەنە، لە پێچەوانەی یەك بێن، چونکە شتەکان لە باری بەیەکدژیدا هەر دوو دژن بەیەکتر نەك زیاتر.

ـ پیاو دائەنیشێ و ژنان دەگەڕێن

شەرم نامێنێ ژن و پیاو هاوڕێن... پیەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەمدا مادام بەراورد لە نێوان (ژن) و (پیاو) دەکرێت لەسەر دانیشتن و کارکردن، بێگومان ئەگەر پیاو دابنێشێ، کەوابێت ژن دەبێت بگەڕێن، چونکە ڕستەکان ببەیە باری ڕستەی مەرجییەوە ئەو چەمکەت لەلا دروست دەبێت، دەی مادام شاعیر دەڵێت (پیاو دائەنیشێ)، بێ ئەوەی تەواوی بکات، خوێنەر دەزانێت، کە ئێستا دەڵێت (ژن دەگەڕێن)، چونکە ڕستە یەکەمەکەی (پیاو دائەنیشێ) هێماکەرە بۆ ئەو ڕستەی دووەمە، کە هەر زوو لە زەینی خوێنەردا دروستی دەکات. ئەوەش تەوسەو شاعیر وەکو ڕەخنە دەیخاتەڕوو لە دابی سەردەمی نوێ.

ـ یا ڕەسوڵەڵڵا
لەم زەمەنە تەنها تۆ
بووی بە برام،
خوا لە برایەتیت کەم نەکا بۆ من
بووی بە چرام،
خوا لە ڕۆشناییت کەم نەکا بۆ من... فوئاد کەلهوڕی

شاعیر کاتێك دەڵێت: بووی بە برام.. خوا لە برایەتیت کەم نەکا.. لە پاشان دەڵێت: بووی بە چرام.. خوێنەر یەکسەر بیری بۆ ئەوە دەچێت، دوای ئەوەش بڵێت: خوا لەو نورەشت کەم نەکات، کە لە چرای تۆ پێم دەگات، چونکە بەشی یەکەم، بە واتا و بە دەربڕینیش هەر هێما بۆ واتایەکی وەها دەکەن، کە دەربڕینەکەش تەواودەکرێ، دەبینین شاعیر هەر ئەوە دەڵێت، کە خوێنەرە وشیارەکە بۆی چووبوو، بەو جۆرەش لە دوربڕین و ئاخاوتندا دەگوترێت (هێماکەر).

## هاوسەنگیکردن:

بریتییە لە هێنانەوەی دوو دەربڕینی تەواو واتا لەیەك جیا، کە کاری واتای دووەم هاوسەنگی کاری واتای یەکەمە، بۆ نموونە:

ـ دەی سا جەنەڕاڵ غۆڕۆی گەڕۆڵ
قاچی چەپەڵی تاوانت
لەسەر گڵکۆی ئەییوبی دلێر لابەرە
بڕۆ فریای بووڕکانی سەرپۆشبەسەری پاریس کەوە
ئینجا نۆرە هی ئێمەیە
لە خزمەتی باوا (صەلاح)ماندا بڵێین:
قوربان شوکر هاتینەوە... جەلالەدین نەجمەدین

جەنەڕاڵ غۆڕۆ سەرکردەی سوپای داگیرکەری فڕەنسییە، دوای هێرشەکانی ناپلیۆن بۆ سەر وڵاتانی جیهانی ئیسلامی و داگیرکردنی شام، کە دەچێتە سەر گۆڕی سەرکردە سەلاحەدینی ئەیوبی، ئەو سەلاحەدینەی بەری لە شاڵاوی خاچپەرستانی ئەوروپی گرتبوو، لە سەدەکانی زووتر و جیهانی ئیسلامی و (قودس)ی لە دەستیان رزگارکردبوو، غۆڕۆ کە هاتە سەر گۆڕەکەی شاپی لێداو گوتی: صەلاحەدین ئەوە هاتینەوە، واتە ئەمجارە ئێمە سەرکەوتین و ئێوە

شکستتان هێنا.. شاعیریش دەڵێ: بەڵام جەنەڕاڵ غۆرۆ ئەمجارە ئێمە دەڵێین هاتینەوە، واتە: ئێمە سەرکەوتین.. ئەم کارەش هاوسەنگی کردنە، لە نێوان دوو هەڵوێست، هەڵوێستی دووەم هاوشێوەی هەڵوێستی یەکەمە، بەڵام ئاراستەکەیان لە یەکتری جیایە.

## گێڕانەوەی گفتوگۆ:

عەرەب (الترجیع في المحاورة) و (المراجعة)ی پێدەڵێن: ئەوەیە قسەکەر گفتوگۆییێکی نێوان خۆی و یەکێکی دیکە بە کورتترین دەربڕین و کەمترین وشە بگێڕێتەوە.. بەڵام هەیشە ئەم پێناسەیەی فراوانتر کردووە و گوتوویەتی: ئەوەیە قسەکەر گفتوگۆییێکی نێوان خۆی و خەڵکی تر، یان نێوان دوو کەسی تر، بە کورتترین دەربڕین و ناسکترین سەبك و ئاسانترین وشە بگێڕێتەوە، ئەمەی بخاتە سنووری تاکە دێڕێك، یان چەند دێڕێك، یان یەك رستە.. بە پێی ئەم پێناسەیەی دووەمیش، سنووری تیاگێڕانەوەکە دەستنیشانکراوەو لە رستە و دێڕ و چەند دێڕ کورتکراوەتەوە، هەروەها ئەوەش خراوەتەڕوو، کە گفتوگۆیە گێڕدراوەکە مەرج نییە لە نێوان تەنیا نووسەر و یەکێکی دی رووی دابێ، بەڵکو دەشێ لە نێوان خۆی و کەسانی تر و یانیش هەر لە نێوان کەسانی تر روویدابێ.

بە کورتی: (گێڕانەوەی گفتوگۆ) داڕشتنەوەی گفتوگۆییێکە، کە لە نێوان دوو کەس، یان زیاتر رووی دابێ، جا قسەکەر خۆی یەکێکیان بێ، یان نا، مەرجیش ئەوەیە وشەو دەستەواژەکانی ناسك و روون و جوان بن و شێوازەکەی کاریگەر بێ، شتی زیادی تێنەکەوێ و حەشوی نەبێ، یان کەم بێ، ئیتر لە رستەو لە تاکەدێڕێك جێی ببێتەوە، یانیش چەند دێڕ و یان تەواوی هۆنراوەییێکیش بگرێتەوە.. بۆ نموونە:

- نیوەڕۆیە و رۆژ گیراوە
لە دەرگەزێن، لە کانێسکان
لە سەرشەقام، لە حاجی حان
لە گشت لاوە
تەقە و ریزی دەمانچەیە
تەقەی تفەنگ
هاوارە و دەنگ
- چی رووی داوە؟

ـ وتيان: لە ناو چەقی بازاڕ
چوار کوژراوە
چوار زامدارە.. خوێن ڕژاوە
گەرمە تاوان
ـ وتم: ئەو کوژراوانە کێن؟
وتیان: بران... شێرکۆ بێکەس

ئەمەی ئێرە گفتوگۆی نێوان شاعیر و جەماوەری نێو بازاڕە، کە لە بارەی کارەساتێکەوە لەگەڵ یەك دەدوێن.

جاری وەهاش هەیە، ئەو گفتوگۆیەی دەگێڕدرێتەوە خوازەییەو خەیاڵی شاعیر چنییەتی، دیارە لێرەدا مەبەست راستی و خەیاڵی گفتوگۆکە نییە، چونکە ئاساییە، لە گفتوگۆی سەرووش رۆڵی خەیاڵ دیارە لە چنینی گفتوگۆکە و دەشێ ئەویش راستەقینە نەبێ و خەیاڵی شاعیر دایهێنابێ، بەڵام لەبەر ئەوەی لەم گفتوگۆیەی خوارەوە قسەکەران، ئەوانەی گفتوگۆکە لەگەڵ یەك دەکەن ئادەمیزاد نین، بۆیە خوازەیی ئەمەی خوارەوە روون دیارە، بەڵام لە نموونەکەی سەروو گفتوگۆیەکی ئاسایی بەرهەمهاتووە.. بۆ نموونە:

ـ لە کۆچدا بووم
ئاوێکم بینی ئەگریا
لام داو.. وتم:
بۆچی ئەگریت؟
وتی: رووبارێ بووم، پێش تۆ
هاتن لێیان شکاندمەوە
لێیان بڕیم
بۆیە ئەگریم... شێرکۆ بێکەس

# بەشی سێیەم
# جوانکاری تێکەڵ

وەکو لە (جوانکاری شیعری کلاسیکی کوردی)ش ئاماژەم پێکردووە: ئەم بەشە بۆ یەکەمجارە من بۆ باسەکانی جوانکاری زیادی دەکەم، دەنا پێشە من نە لە بەلاغەی عەرەبی و نە لە رەوانبێـژی کـوردی، کەسی تر ئاماژەی بۆ نەکردووە، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەم دوو باسەی لێرەدا تیشکیان دەخەمە سەر، لە راستیدا هەردووکیان تێکەڵن لە هونەری وشەیی و هونەری واتایی جوانکاری و تەنانەت لە هونەرەکانی دیکەی رەوانبێژیش، لەبەر ئەوەشە بەلامەوە دروست نییە، ئەم دوو هونەرە نە لەسەر یەکەم و نە لەسەر دووەمیش حیسێب بکرێ، بۆیە بەم شێوەیەم دابەشکرد.

### ئیقتیدا:

ئەوەیە شاعیر لە دێرەکانی خۆیدا شوونپێی داهێنانی شاعیرێکی پێشە خۆی هەڵگرێتەوە، ئەو چۆنی نووسیوە، ئەمیش بە هەمان شێوەی ئەو بنووسێتەوە، بەڵام بێگومان بە واتایەکی نوێ، چونکە ماوەی نێوان دوو شاعیرەکە، هۆکارە بۆ بەرەوپێشچوونی مەبەست لە یەکەمەوە بۆ دووەم.

ئیقتیدا بە گشتی سێ جۆری هەیە، یان شاعیر بە کێش و سەروا و وشە و دەربڕین و بە گشتی بـە رواڵەتی شیعری شاعیرێك کارتێکراو دەبێت و دێت بە ئیقتیدا کردن بەم شیعرەی شـیعرێکی هاوشـێوە دەنووسێ، یان شاعیر بە ناوەڕۆکی شیعرێك کارتێکراو دەبێت و دێت شیعرێك بە هەمان واتا، بەڵام بـە وشەو دەربڕینی جودا دەنووسێت، یانیش بە هەردوو لایەنی شیعرێك کارتێکراو دەبێت و دێت لە هەردوو رووەوە شوونپێی شیعرەکەی پێشە خۆی هەڵدەگرێتەوە، بەم شێوەیە ئیقتیدای واتایی و ئیقتیدای رواڵەتی و ئیقتیدای کۆی واتاو رواڵەت دروست دەبن... بۆ نموونە.

ـ مەلەوانەکەی دەریای قورئان رۆ

ڕۆژگاری دانا ژیری کیژان رۆ

باخەوانەکەی باخی ژیان رۆ

بولبولی سەرچڵ نوری ئیمان رۆ

نمونەی کیژی ئەم جیهانەم رۆ

ئەستێرەی بەرزی نێو ئاسمانم رۆ

ڕۆژگاری شاری پڕ ئیمانم ڕۆ
سەنگەرشکێنی دوژمنانم ڕۆ
قەڵا بەرزەکەی کوردستانم ڕۆ... ڕەنجدەر .. پاوە

ئەم شیعرە بە بۆنەی شەهیدبوونی (ڕۆژگار خان)ی کچی صالح هەژاری شاعیر دانراوە، کە یەکێك بووە لە مامۆستا خاتوونەکانی کورد و لە کارەساتی هەڵەبجە بەر کیمیاوییەکە کەوتووە، سەرەنجام شەهید بووە.

شاعیر لەم شیعرەیدا ئیقتیدای بە شێوازی شیعرێکی مینە جاف کردووە، کە بۆ مەرگی (بێکەس)ی شاعیری نووسیوە، تیایدا وەهای لاواندۆتەوە:

ـ دەریای مەعریفەت سەر شاعیرم ڕۆ
ئەدیب و داناو هەم ماهیرم ڕۆ
فیردەوسی گوفتار بێ دڵ پیرم ڕۆ
حاج قادری کۆیی بەرز و ژیرم ڕۆ
داواچی تۆڵەی کوردستانم ڕۆ
سەرۆکی پۆلی شاعیرانم ڕۆ... مینە جاف

شیعرەکان هەردووکیان (دە بڕگەیی)نە و هەردووکیانیش پاش قافیەیان (ڕۆ)یە، کە وای کردووە هەردووکیان بە یەك ئاواز بخوێنرێنەوە.

ئیقتیدای نەجات ئەسپیندارەیی بە حاجی قادری کۆیی

حاجی قادری کۆیی گوتوویەتی:

ـ تۆ خۆش دەبەزی ئەسپی بەزیتنت پێیە
من ناگەمە تۆ ئەسپی بەزینم پێیە... دیوانی حاجی قادری کۆیی

نەجات ئەسپیندارەییش ئیقتیدای بەم دەربڕین و بیرە جوانەی حاجی قادری کۆیی کردووەو هاتووە لە چوارینێکیدا نووسیویەتی:

ـ لەشکر دەهات لەشکر دەچوو
تەنها مردنیان هاوڕێ بوو
هەندێك لەوان گوڵوبان بوون ئەسپیان پێ بوو
هەندێکی تر پیادەبوون و ئەسپیان پێ بوو... نەجات ئەسپیندارەیی

## داهێنان:

عەرەب (ابداع)ی پێدەڵێن.. بریتییە لەوەی شیعر، یان ئاخاوتن بە گشتی چەند جۆرێکی جوانکاریی تیا بێت.. دیارە لێرەدا مەبەست لە وشەی جوانکاری واتای زاراوەیی نییە، بەڵکو واتای وشەییتی، بە واتا: ئاخاوتن چەند هونەرێکی جوانی ڕەوانبێژی لەخۆ بگرێت.. ئەوەتا (ابن ابي الأصبع) کاتێك باس لە جوانکارییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکات: ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾..(هود : ٤٤).. دێت هونەرەکانی تیا بەرجەستە بووی دەژمێرێت، دەڵێت: ئەم هونەرانە لە خۆ دەگرێت: دژیەك، حسن النسق، جوانی بایس، دابەشکردن، ئاماژە، هێماکەر، ارداف، ایجاز، خوازە، خواستن و... هتد. دیارە هیچ یەکە لە خوازە و خواستن سەر بە زانستی جوانکاری نینە.

بە کورتی: داهێنان ئەو دەربڕینانە دەگرێتەوە، کە دەوڵەمەند و جوانکرابن بە ژمارەییەك هونەری لێکجیای ڕەوانبێژی و بە هەموویان جەمالیاتێکی دڵگیری پێ بدەن.. بۆ نموونە:

ـ مانگی بەجێما و لە سەفەری شەو

زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کەو... گۆران

١- سەفەر هی مرۆڤە دراوەتە شەو، ئەمەش (خواستنی درکاو)ە.

٢- بەجێمان لە سەفەر هی مرۆڤە دراوەتە (مانگ) ئەوەش دیسانەوە (خواستنی درکاو)ە.

٣- ترسان لە قاسپە قاسپی کەو هی مرۆڤە دراوەتە (مانگ) ئەوەش دیسانەوە (خواستنی درکاو)ە، دەنا مانگ ناترسێ، چونکە ئەقڵی نییە.

٤- زەردبوون لە ترسان هی مرۆڤە دراوەتە (مانگ)، چونکە ئەوە مرۆڤە ئەقڵی هەیەو کە بەرژەوەندییەکانی دەکەونە مەترسی ترسی لێدەنیشێت و خوێنی باش ئیش ناکات و ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت، ئەوەش دیسانەوە (خواستنی درکاو)ە.

٥- وشەکانی (شەو) و (کەو) تەنها لە پیتی یەکەمیان لە یەکتری جیاوازن، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی جودایە.

٦- دێڕەکە بەسەریەکەوە هەواڵێکی خوازەیی لەخۆ دەگرێت، بۆ مەبەستی داهێنانی شیعری نووسراوە، نەك بۆ مەبەستی گەیاندنی هەواڵێکی دروست بە خوێنەر.

٧- لە دێڕەکەدا هونەری (جوانی بایس) هەیە، چونکە ڕاستییەتی زەردبوون و نەمانی شەوق و ڕووناکی مانگی بەرەبەیان، هۆکەی دەرکەوتنی (ڕۆژ)ە، کەچی شاعیر ئەو هۆیە دروستەی شاردۆتەوەو لێکدانەوەی شاعیری بۆ ئەو دۆخە کردووە، گوتوویەتی، لەبەر ترسی قاسپەی کەو زەرد بووە، ئەوەش جوانی بایسە.

٨- دێڕەکە بەسەریەکەوە (موبالەغە)یەکی جوانی تێدایە، بۆ قاسپە قاسپی کەو و زۆر زیاتر لە خۆی گەورەی کردووە، بەو رادەیەی نەك دڵی خەڵکی زەوی، بەڵکو دڵی (مانگ)یش دەترسێنێ، ئەوەش زێدەڕەوی (موبالەغە)یەو راست نییە.

٩- مانگ و شەو هونەری (چاولەیەك)ن و هەردووکیان بۆ واتای دروست هێنراون.

ـ ئیتر لەسەر لێوی بەیاز، زەردەخەنەی رۆژ نابینن

ئیتر لە بێشکەی خەیاڵ کۆرپەی ئاواتمان نابینن... سوارەی ئیلخانی زادە

١- لێو هی مرۆڤە دراوەتە، بەیاز، ئەمە خواستنی درکاوە.. (بەیاز: زاراوەیەکی رۆژهەڵاتییە، بێگومان لە وشەی (**بیاض**)ی عەرەبی وەرگیراوە، بریتییە لە دەفتەرێکی درێژکۆڵە، ئەوەی من بینیومە قەوارەکەی( ٩سم بە ٢٣سم)ێك دەبوو، ئەمە وەکو کەشکۆڵی گیرفانە، فەقێ و مامۆستای ئایینی حوجرەکان لە گیرفانی سەڵتە و کەواکانیان جێیان کردۆتەوە، ئەو شیعر و بابەتە بەسوود و زانیاریانەی دیکەیان تیا نووسیوەتەوە، کە بۆ رۆژگاری خۆیان گرنگ بوونە، بە پڕبوونەوەی ئەم (بەیاز)ەش دیارە (بەیاز)ەکە بووەتە کتێبێکی گیرفان، ئیتر بۆ رۆژی خۆی، ئەوەی چەند (بەیاز)ێکی پڕی لەمانە هەبووایە، ئەوە بێگومان رۆشنبیر و خوێندەوارێکی گەورە بووەو دڵیشی بەخۆی خۆشبووە، کە لە نێو خەڵك جارجارە دەری کردووە و شتی تیادا بۆیان خوێندۆتەوە).. ئەمەم بۆ یەکەم جار لای دکتۆر مارف خەزنەدار بینیوە.

٢- زەردەخەنە هی مرۆڤە دراوەتە، رۆژ، ئەمە خواستنی درکاوە.

٣- بێشکە هی منداڵە دراوەتە خەیاڵ، خواستنی درکاوە.

٤- کۆرپە هی مرۆڤە، دراوەتە ئاوات، خواستنی درکاوە.

٥- نیوە دێڕی یەکەم هەواڵێکی خوازەییە، واتە: چیتر خۆشی نابینن.

٦- نیوە دێڕی دووەم بە هەمان شێوە، هەواڵێ خوازەییە، واتە: چیتر ئاواتەکانمان وەدی نایێن و ئەوە نابینن وەدی بێن.

٧- ئیتر دوو جار لە سەرەتای هەردوو نیوە دێڕەکە گێڕدراوەتەوە.

٨و٩- لە هەردوو نیوە دێڕدا بکەری رستەکان (ئێوە)یە، ئەم بکەرە لابراوە و کورتبڕی ئەنجامدراوە.

# سەرچاوەکان

**یەکەم: کتێبی ڕەوانبێژی بە زمانی کوردی**

١- ئازاد عەبدولعزیز مزوری، جەلادەت بەدرخان و شیعر (لێکۆلینەکە شرۆڤەکارییە) دەزگەها چاپ و وەشانا سپیرێز، دهۆك، سالٌ ٢٠٠٦ز.

٢ـ ئیدریس عەبدوڵلا، جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣ز.

٣ـ ئیدریس عەبدوڵلا و نووسەرانی تر، کوردۆلۆجی، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٩ز.

٤ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم: جوانکاری، چاپی یەکەم، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر، ١٩٧٥.

٥ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی سێیەم، واتاناسی، ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، ١٩٧٩ز.

٦ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی بۆ پۆلی دووەمی پەیمانگاکانی مەلبەندی مامۆستایان، پۆلی پێنجەمی پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایان، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٤٢٣هیجری، ٢٠٠٢زایینی.

٧ـ عەلائەدین سەجادی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، .١٩٦٨

٨ـ عەلائەدین سەجادی، خۆشخوانی، هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٨٦.

**دووەم: کتێبی ڕەوانبێژی (بلاغە) بە زمانی عەرەبی**

٨ـ ابن عبدالله أحمد شعیب، بحوث منهجية في علوم البلاغة العربية، دار أبن حزم، بيروت ـ لبنان، الطبعة الأولى ١٤٢٩هـ، ٢٠٠٨م.

٩- د. أحمد مطلوب، معجم المصطلحات البلاغية وتطورها، الدار العربية للموسوعات، الطبعة الأولى، الجزء الثالث، الدار العربية للموسوعات، بيروت - لبنان، ١٤٢٧هـ، ٢٠٠٦م.

١٠- د. احمد مطلوب، فنون بلاغية، (ط:١)، كويت ١٩٧٥.

١١- د. انعام فوال عكاوي، المعجم المفصل لعلوم البلاغة العربية، مراجعة: أحمد شمس الدين، الطبعة الثانية (طبعة جديدة منقحة)، دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان، ١٤١٧هـ، ١٩٩٦م.

١٢- خطيب القزويني، الايضاح في علوم البلاغة طبعة ايران.

١٣- سعدالدين تفتازاني، شرح المختصر، ج:٢، طبعة ايران.

١٤- د. شوقي ضيف، البلاغة تطور و تاريخ (ط:٣)، مصر ١٩٧٦.

١٥ - الأمام العلوي، الطرازلأسرار البلاغة وعلوم حقائق الأعجاز، جـ٣.

١٦- علي الجارم ومصطفيَ امين، البلاغة الواضحة، طبعة مصر، ١٩٦٩.

١٧- محمود البستاني، القواعد البلاغية، (ط:١)، مشهد ١٤١٤هجريية.

١٨ - علي بن نايف الشحود، الخلاصة في علوم البلاغة، كتێبی ئەلیکترۆنی، ص ٢٥٦. (لە ئەنتەرنێتەوە)

**سێیەم: لێکۆڵینەوەی زانستی**

١٩- ئیدریس عەبدوڵڵا، هەندێ هونەری جوانکاری لە شیعرەکانی (پیرەمێرد)دا، ژمارە (٦)، ئەکادیمی (کۆواری کۆڕی زانیاری کوردستان)، هەولێر، ٢٠٠٧ز.

**چوارەم: ئەنتەرنێت**

٢٠- لؤي الطيبي، الخلط والالتباس بين المقابلة والطباق، شبكة الفصيح لعلوم اللغة العربية، ٢٠٠٦/٨/١٢.

**پێنجەم: دیوانەکانی شیعری نوێ، ئەوانەی نموونەیان لێوەرگیراوە**

٢١ـ ئازاد دلزار، حاجیلەکانی دەشتی هاموون، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.

٢٢ـ ئەژی گۆران، نەبا غەریبێ جێت بگرێ، چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد، ١٩٧٨.

٢٣ـ کاك ئەحمەدی موفتی زادە، مەولودنامە، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٢٤ـ ئەمین سندی، هەناسەیەکا کورت، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢٥ـ ئەنوەر قادر محەمەد، زایەڵە، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی فەرهەنگی سوێد، ١٩٨٨.

٢٦ـ خوشکە بێخەو، کاروانی خەبات، ١٩٩٩، بەبێ ناوی چاپخانە و شوێنی چاپبوون.

٢٧ـ بەختیار زێوەر، دیوانی بەختیار زێوەر، کۆ: مەحمود زامدار، چاپی سێیەم، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

٢٨ـ پیرباڵ مەحمود، بزەی سروشت، لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، چاپخانەی عەلا، بەغدا، ١٩٨٥.

٢٩ـ جەمال بێدار، دیاری بێداری.

٣٠ـ جەمال گردەسۆری، فرمێسکی ئەوین، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٨.

٣١ـ جەمال گردەسۆری، گڕی شاعیر، چاپخانەی حەوادیس، بەغداد، ١٩٨٩.

٣٢ـ جەلال مەدحەت خۆشناو، گرەو، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٣.

٣٣ـ جەلالەدین نەجمەدین، شنەی سۆز، چاپخانەی ژین، هەولێر، ١٤٢٣هـ، ٢٠٠٢.

٣٤ـ جەمیل رەنجبەر، دیوانی جەمیل رەنجبەر، ئا: جەوهەر کرمانج، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٣٥ـ جەوهەر کرمانج، رەز و زریان و مۆمێکی تر، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، چاپخانەی شارەوانی هەولێر، ١٩٧٨.

٣٦ـ حەسیب قەرەداغی، فەرهەنگی خەم، بەرگی یەکەم.

٣٧ـ خدر کۆساری، بوڕکانی شیعر، هەولێر، ١٤١٨هی، ١٩٩٨ز.

٣٨ـ دلزار، دیوانی دلزار، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر.

٣٩ـ سەباح ڕەنجدەر، شەڕی چڵ ساڵە، ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
٤٠ـ سەعدوڵڵا پەرۆش، کۆشی ئارام، چاپخانەی شیمال، کەرکوك، ١٩٦٩.
٤١ـ سعاد سلێڤانەیی، سۆزما، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، سپیرێز، ٢٠٠٦.
٤٢ـ سوارەی ئیلخانی زادە، زەمزەمەی زولاڵ، کۆکردنەوەی: عەبدولخالق یەعقوبی، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.
٤٣ـ شێرکۆ بێکەس ، دیوانی شێرکۆ بێکەس، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٤٤ـ عەبدولڕەحمان بێلاف، گوڵدانی فرمێسك، هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦.
٤٥ـ عەبدولخالیق عەلائەدین، دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی کورد (چ:١) بەغداد.
٤٦ـ عەبدوڵڵا پەشێو، شەونامەی شاعیرێکی تێنوو، چاپی ئێران ١٩٧٢.
٤٧ـ عەبدوڵڵا پەشێو، شەونییە خەونتان پێوەنەبینم (چ:١) بەغداد ١٩٨٠.
٤٨ـ عەبدوڵڵا پەشێو، دیوانی دکتۆر عەبدوڵڵا پەشێو، چاپی یەکەم، سوێد، ٢٠٠٢.
٤٩ـ عەبدوڵڵا صالح شارباژێڕی، ڕووبارێکی هەڵچوو، چاپخانەی نەوڕەس، سلێمانی، ١٩٨٦.
٥٠ـ عەبدوڵڵا عەزیز خالید، دیوانی کامەران موکری (چ:١) هەولێر، ١٩٨٨.
٥١ـ عەبدوڵڵا عەزیز خالید، دیوانی شیعری (دیلان)، (چ:١) بەغداد، ١٩٨٧.
٥٢ـ عەلی فەتاح دزەیی، خرۆشان و رامان، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٧.
٥٣. عەلی شەریعەتی، یەك لەپەنای خاڵ و سیفری بێ بڕانەوە و:هەژار، (چ:١) ئێران.
٥٤ـ عوسمان مستەفا خۆشناو، مەرگ و لە دایکبوونەوەیەکی نوێ، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٩.
٥٥ـ عوسمان محەمەد هەورامی، جیهانە جوانەکەمان، ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
٥٦ـ عوسمان شارباژێری، کاروان، کەرکووك (چ:١).
٥٧ـ عومەر سەیدە، بەرەو شێت بوون، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

٥٨ـ فەرهاد شاکەلی، ژێ، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، کوردستان، ٢٠٠٠.
٥٩ـ کەریم دەشتی، درەختی حیکمەت، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١.
٦٠ـ کەمال فەرەج تۆفیق، رەهێڵە، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٣.
٦١ـ کۆمەڵە شاعیر، خەزانی هەڵەبجە، نەشری شاهێد، ١٣٦٨ی هەتاوی، ئێران.
٦٢ـ گۆران، سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، بەغداد ١٩٨٠.
٦٣ـ گۆران، دیوانی گۆران، چاپخانەی دالاهو، تەهران، ١٣٨٦هەتاوی.
٦٤ـ لەتیف هەڵمەت، دیوانی لەتیف هەڵمەت، چاپخانەی شیڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٦٥ـ مارف ئاغایی، زەوی سەخت و ئاسمان دوور، چاپخانەی شوعاع، تەورێز، ١٣٧٧ هـ.
٦٦ـ محەمەد حسێن بەرزنجی، تریفە و رێژاو، لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، چاپخانەی حەوادیس، بەغدا، ١٩٨٥.
٦٧ـ محەمەد رەسول هاوار، دیوانی (پیرەمێرد)، (چ:١) بەغداد ١٩٦٨.
٦٨ـ محەمەد صالح دیلان، دیوانی شیعر، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: عەبدوڵڵا عەزیز خالد، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، چاپخانەی سۆمەر، بەغداد، ١٩٨٧.
٦٩ـ محەمەد صاڵح دیلان، بارانی سلێمانی، ئا: ئومێد ئاشنا، دەزگای ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
٧٠ـ موکەڕەم رەشید تاڵەبانی، بەردەباز، چاپخانەی زەمان، بەغدا، ١٩٨٦.
٧١ـ مینە جاف، دیوانی مینە جاف، کۆکردنەوەی: مستەفا نەریمان، چاپخانەی جاحز، بەغدا، ١٩٩٠.
٧٢ـ نەژاد عەزیز سورمێ، چەند کۆتەڵێکی جەنازەیی، (چ:١) کوردستان ١٩٩٥.

**پێنجەم: رۆژنامەو گۆڤارەکان**

٧٣ـ عەلی شێخانی، رۆژنامەی کوردستان راپۆرت، ژ: ٣٤١، ٢٠٠٧/١١/٢٧.
٧٤ـ فوئاد کەهوری، رۆژنامەی یەکگرتوو، ژمارە (٦٣٩)، سێشەممە ٢٠٠٧/٥/١٥.
٧٥ـ خورشیدە بابان، گۆڤاری بەیان، ژمارە (٩٩).

شەشەم: ئەو شیعرانەی لە گۆرانییەکان وەرگیراون.

٧٦ـ دێینەوە، کامەران مستەفا.

٧٧ـ جەژن، دانا عەبدولجەبار.

٧٨ـ لاوکی هەڵەبجەی، رەفیق سابیر.

٧٩ـ گۆرانی (ئەی محەممەد)ی هاشم رێکانی و قاسم گەلاڵی، کە: ئەیاد محەمەد دەیلێت.

٨٠ـ گۆرانی (دڵە بۆ هەوەس)ی ئەیاد محەمەد.